ئیحسان نوری پاشا



# راپەڕینی ئاگری

وەرگێڕانی: ئەرسەلان بایز



Scmme

ئیحسان نوری پاشا

# راپەڕینی ئاگری

وەرگێڕانی: ئەرسەلان بایز

چاپی دووەم

* ئیحسان نوری پاشا
* راپەرینی ئاگری
* وەرگێڕانی: ئەرسەلان بایز

* چاپی یەکەم لە چاپخانەی بەرەی کوردستانی۔ عیراق چاپکراوە
* ساڵی ١٩٩١
* تیراژ (١٠٠) دانە
* چاپی دووەم ۔ ساڵی ١٩٩٥
* تیراژ (٥٠٠) دانە
* چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان

ئیحسان نوری پاشا

# راپەرینی ئاگری

وەرگیرانی : ئەرسەلان بایز



وێنەی بەرگی یەکەمی چاپی یەکەم

ئاگری دیسا بکڕو هێرسا خوە تژە بوویە
ئاگری ،. ئاگری.. ئاگری خوین دگری.
ئەمی گازیا خوە ببن ئێل و مالباتێن کوردا
بلا دگازیا مە وەرن
ئیرۆ رۆژا تەنگیێیە، بێ کارو بێ کێرنایە
هەچیێ بناموس و شەرەفە
بلا دگازیا مە وەرن
هەچیێ بێ غیرەت و بێ کێرن
بلا دهەمبێزێ ژنێ خوە دا بمینن
فەلەکا خاینە نەڕندە.



**وێنەی بەرگی دووەمی چاپی یەکەم**

# پێشەکی:

ئیحسان نوری یەکەمین فەرماندەی راپەرین و شۆرشەکانی کوردستانە ، کە یاداشتەکانی خۆی بڵاوکردبێتەوە.

بێگومان ئەم بڵاوکردنەوەمیەش جیا لەوەی و ردەکاریەکانی راپەرینی ئاراراتی بەزیندوێتی هێشتوتەوە، دەرس و پەندێکی زۆریشی بۆ نەوەکانی داهاتوو بەجێ هێشتووە، ئەگەر بەووردی تێی بروانرێ و سودی لێ وەربگیرێت. ئەگەر چی ئیحسان نوری زیاتر فەرماندەیەکی سەربازی بوو لەوەی سیاسی بێت، بەڵام بەراستی فەرماندەیەکی ئازاو لێ هاتوو بوو لەنەخشە کێشانی سەربازی و بەشداری و رابەرایەتی کردنی شەرەکان.

یەکێ لەپەندەکانی ئەو یاداشتە ئەوەیە کە ئیحسان نوری نەهەروا بە ئاسانی دەستی لە راپەرینەکە هەڵگرتووەو، نەراپەرین و خەڵکەکەشی لە تەنگانەدا جێ هێشتووە، بەڵکو هەتا توانیویەتی و زەرفەکە دەرفەتی داوە هەموو بەیەکەوە جەنگاون و رووبەرووی دوژمن بوونەتەوە، لەم نامیلکەیەدا بۆمان دەردەکەوێت ئیحسان نوری ژیانی خۆی و خێزانەکەی لە ژیانی هاوەڵەکانی و خێزانەکانیان خۆشتر نەویستووە، ئەگەر وانە بووایە قسەو داواکاری نوێنەری تاشناقەکانی پیادە دەکردو خۆی و خێزانەکەی لە ئابلوقەکە دەچوونە دەرەوەو خەڵکەکەیان جێ دەهێشت.

بێگومان ئەمەش مەرجێکی بنەرەتی هەر فەرماندەیەکە بۆ پاراستنی ورەی هاوەڵەکانی و پاراستنی راپەرین و شۆرشەکە.

لەپەندەکانی تری ئەم یاداشتە:

- نەبوونی رێکخستنێکی پێویست، دانیشتوانی ناوچەکانی ترو شارەکان لە ئاستی پێویست دا نەبوون.

سازو ئامادەنەکرابوون تاکو شان بە شانی راپەرینی خەباتی چەکداری شاخ بەرێوە بچێت و، لە هەموو لایەکەوە گوشار بخەنە سەر دوژمن. دیارە بەمەش پشتیوانیەکی گەورەی خەباتی چەکداریان دەکرد و سەریان لە دوژمن دەشێواند.

- هێزەکان عەشایەرو دێهاتی بوون، زۆربەی فەرماندەکان دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەت بوون، چەك و تفاقی جەنگی پێویست نەبوو، بۆیە شەڕەکانیان کلاسیکی و دواکەوتوو بوو.

-ناتەبایی و ناکۆکی نێوان فەرماندەکان دەردێکی کوشندەی راپەرینەکەو تێکشانەکە بوو.
- ژمارەی هێزەکانی دوژمن و تفاقی شەڕیان بە جۆرێ بوو کە لەگەڵ هێزەکانی ئاگری بەراورد نەدەکرا.

-پشت بەستن بە دەوڵەتی رەزا شا، هەڵەیەکی کوشندەبوو.
-کۆمەکی شورەوی و ئێران یاریدە دەرێك بوو بۆ سەرکوت کردنی راپەرینەکە.
دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کەلە هەندێ شوێنی ئەم یاداشتەدا، نووسەر بەشان و باڵی خۆی هەڵدەدات کەبە راستی لەگەڵ سەرجەم نامیلکەکەدا پێچەوانەیە.

بۆیە من پێم وایە بەشار خانمی خێزانی دەسکاری کردووە، چونکە ئەو دەستی نووسینی هەبوو، یان هەر چۆنێ بێ دەستێکی ناموی گەیشتۆتێ.

ئەرسەلان بایز

١٩٩١

## ڕاپەڕینی ئاگری:

ڕاپـەڕینی ئاگـری لاپـەڕەیەکی پرشنگدارە لە مێژووی خەباتی پڕ شانازیٚ نەتەوەی کوردی ئاری. لە ڕێگای سەربەستی و ئازادی نەتەوەیی خۆی دا. ڕاپەڕینی ئاگری هاواری دڵسـوتـاوی نەتـەوەی کوردی بێ بارو سـتـەم دیـدەیــە کە دوو چاری جۆرەها ئازارو چەوسـانــەوەی نەتــەوایەتی بووە... ڕاپەڕینی ئاگری خوڕینی (قیرینـی) سەربەخۆیی خەڵکی کوردی دیل و ڕەبەن و هەژارە. لە بەرامبەر هەموو گەل و کۆمەڵێك دا.

ڕاپەڕینی ئاگری بەڵگە نامەیەکە بەخوێنی پیرو لاوو منالانی کورد نووسراوەتەوەو بە دەستی نوێنەرانی نەوەکانی داهاتوی خۆی سپاردووە.

تێکـۆشەرانی کورد لە ئاگری بەدنیایان ڕاگەیاند کە لە دڵی ئەم نەتەوەیەدا بریسکەی عەشق وپەرۆشی بۆ سەربەخۆیی داگیرساوە.

مەبەست لەم نامیلکە بچوکە هەر تەنیا ئەوە نیە خوێنەر بە تێکۆشەرە نەتەوەییەکانی کورد لە کوردستــانی تورکیــا بنــاسێنــین. بەڵکو مانەوەی شەکانەوەی چوار ساڵی ئاڵای سەربــەخــۆیی کوردستانیشە لەسەر دۆندەکانی ئاگری. قوربانیو گیانبازی جەنگاوەرە ئازاکانی ڕۆڵەی ئەم گەلی کوردە بوو کە نەیانهێشت تورکەکان ئەم ئاڵایە بێننە خوارەوە. لەپێناوی بەردەوام بوونی شەکانەوە شیدا قارەمانیەتیەکی بێوێنەیان لەسەر ئەو شاخە تۆمارکرد. شەهامەت وئازایەتیو جەسارەت لە شەڕدا مەسەلەیەکی دێرینەی ڕۆڵەکانی ئەم گەلەیــە. کە پشتاو پشت لە باوو باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە. وە نەبێ لەو قارەمانێتیو دلێری‌یــەشـدا هیــچ جیاوازی‌یەك لە نێو کوردەکانی باشوور لەگەڵ برایەکی کوردی لە لورانی شوانکارەو ئەرزە ڕۆم وهۆزەکانی قۆچان لە ڕۆژهەڵاتی ئێران و، هۆزە کوردەکانی ئەسکەندەرۆنەدا هەبێت. هەموو ڕەگەزی ئاری خاوەنی ئەو ئازایەتیو گیانفیداکاری‌یەن ئازایەتی ئاگری‌یەکان تایبەتمەندی‌یەك نیە بەوان وکوردەکانی‌تری لێبێ بەش بێت. بەڵکو سیفــەتێکی هاوبەشی هەمــوو ڕەگەزی کوردە. نموونەیەکی ئەم قارەمانێتیە کوردەکانی باکوری عێراقن.

پێش دەست پێکردن بە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئاگری. بە پێویستی دەزانم پەنجە بۆ لەخــۆبــووردوویی ئەو کوردە شۆڕشگـێڕانە درێژ بکەم کە ڕەزامەندیو ئازادی خۆیان. خوێنی خۆیان کردە قوربانی سەربەخۆیی گەلەکەیان.

هێنـدەی من بزانم کوردانی تورکیا تا ساڵی ١٥١٤ ز لەسەر شێوەی (ملوك الطوائف) دەژیـانو. لەو وڵاتەدا سوڵتانی عوسمانی و خەلیفەی موسوڵمانەکان سوڵتان یاوز سلیم دوای ڕاوێژ کردن لەگەڵ مەلا ئیدریسی بەدلیسی و ئەمیرە کوردەکان.

دانی بە سەربەخـۆیی زاتی ئەمارەتەکانی کورد دانا. بەناوی خۆیان سکە لێ بدەن. ساڵانەش لە بری پاراستنیان لە لایەن سوپای عوسمانیەوە نوێنەری خۆیان لەگەڵ هەندێ دەرامـەت وەکـو پاداشت ڕەوانـەی لای سوڵتان بکەن لەکاتی شەڕیش دا، ئەمارەتەکان پشتیوانی لە سوڵتان بکەن. خەلیفە بە بڵاوکراوەیەك ئەم بڕیارەی بە ڕەسمی ڕاگەیاند.

کاتێ سوڵتـان مورادی عوسمـانی هاتـە سەر حوکم تۆوی دووبەرەکی خستە نێوان ئەمارەتەکان و دژی یەکتر هانی دان و حکومەتەکانی لە ناوبردن. تەنیا ئەمارەتەکانی بەدلیس و ئامێدی و هەکاری توانیان تا ساڵی ١٦٩٠ز. سەربەخۆیی زاتـی خۆیان بپارێزن. ساڵی ١٦٩٧ تورکەکان ئەمارەتی بەدلیسیان لەناوبردو تاڵانیان کرد.

میر محمد پاشای ڕەواندوز ساڵی ١٨٣٢ لە ناوچەی سۆران شۆڕشی ڕاگەیاند، بەمەبەستی فێربـوون و دروست کردنی تۆپ هەندێ کەسی ڕەوانـەی ڕوسیا کرد (هەندێ لە مێژوو نووسـان دەڵێن ڕەوانـەی میسری کردن. ئەوسا محمد علی پاشا فەرمانڕەوایەتی میسری دەکرد. دوای گەڕانەوەی ئەو قوتابیانە بۆ ڕەواندوز دەستیان بە تۆپ دروست کردن کرد بۆ سوپای کورد. تا ئێستاش هەندێك لەو تۆپانە لە ڕەواندوز هەر ماون.

لە ساڵی ١٨٤٣ میر بەدرخان پاشای بۆتان شۆڕشی کردو تاوان گەیشت. بەڵام میر یەزدان شێری خوشکە زای خیانەتی لێ کرد. لەگەڵ توکەکاندا ڕێکەوتوو جەزیرەیان داگیر کرد. ئیتر شۆڕش شکستی خواردو میر بەدرخان نـاچاربوو خۆی تەسلیم بە سوپای تورك بکات. تورکەکانیش لەگەڵ ژن و منداڵەکانی دووریان خستەوە بۆ ئەستەنبوڵ و لەوێ نیشتەجێ یان کرد.

ساڵی ١٨٨٠ ـ ١٨٨١ شێخ عبیداللە نەهری لە شەمدینان شۆڕشی بەرپاکرد دوای ئەوەی دەستی بەسەر ئەو ناوچەیە داگرت. ڕووی کردە ئێران و ناوچەیەکی لەوێ گرت. دواتر لە ڕووی هێرشەکانی سوپای عوسمانی و ئێران وەستایەوە. بەڵام بەداخەوە ئەو شۆڕشەش شکستی خوارد. تورکەکان شێخ عبیداللەیان گرت و لەگەڵ خێزانەکەی ڕەوانەی حیجازیان کرد. تا مردن لەوێ مایەوە.

ساڵی ١٩١٤ سەید عەلی کوری شێخ جلال الدین لە ناوچەی (هیزان)ی سەر بەشاری بەدلیس. بە هاوکـاری مەلا سلیم شۆڕشی بەرپـاکـرد. هەردووکیـان هێزێکی دوو هەزار کەسیان لە چەکداری کورد پێکهێناو پەلاماری بەدلیسیان دا بەهاوکاری دانیشتوانەکەی بەشێکیان لەشارەکە گرت. پاشان هێزە بەدەگەکانی تورك فریای حامیەی بەدلیس کەوتن وهێزەکانی شۆڕشیان بە کشانەوە ناچار کرد. تورکەکان ئابلوقەی بارەگای شۆڕشیان دا لە هیـزان. سەیـد علی خۆیدا بە دەستـەودو لەگـەڵ هەڤـاڵەکـانی لە شاری بەدلیس لە

سیداردران. بەڵام مەلا سلیم خۆی هاویشتە بالیوزخانەی روسیا. پاش ئەوەی یەکەمین جەنگی جیهانی هەڵگیرسا. تورکەکان مەلا سلیم یان لە بالیوزخانە هینایە دەرەوەو لەگەڵ هەڤاڵەکانی لە سیدارەیان دا.

دوای جەنگی گێتی یەکەم. کوردەکانی عێراق لە ژێر حوکمی عوسمانیەکان رزگار بوون. پەیمانی سیڤەردانی بەسەربەخۆیی کوردستان دانا. حکومەتی ئەستەنبوڵ سەری بۆ ئەمری واقع کە چ کرد. بەڵام مستەفا کەمال پاشای سەرۆك کۆماری تورکیا خۆی لەو رێکەوتننامەیە گێل کردو ملی نەدا. یاسایەکی دارشت. بەپێی ئەو یاسایە جیا لە نەتەوەی تورك هیچ نەتەوەیەکی‌تر بوونی نیە لە تورکیادا. هەموو دانیشتوانی تورکیا تورکن!

لە ئەنجامی کاردانەوەی ئەو یاسایە خالد بەگی جیران. سەرکردەی تیپی عەشایەر لە شاری ئەرزەروم. بە هاوکاری ئەفسەرە کوردەکان کۆمەڵەی سەربەخۆیی کوردستانیان پێکهێنا.

ساڵی ١٩٢٤ ئیحسان نوری جیرانی (دانەری ئەم نامیلکەیە) بە هاوکاری چوار ئەفسەری کورد ( راسم ، توفیق ، خورشید ، علی‌رەزا ) بە نیازی رزگارکردنی کوردستان هێزێکی زۆری لە ناوچەی (بیت الشباب ) ی هەکاری کۆکردەوە. بەڵام لە هەوڵەکەیان سەرکەوتوو نەبوون. علی رەزا وەرەی بەرداو هێزەکەی‌بڵاوەی کرد. لە ئەنجامی ئەمەشدا خالد بەگ گیراو رەوانەی بەدلیس کرا.

ساڵی ١٩٢٥ شێخ سعیدی پیران ئاگری شۆڕشی بەرپاکرد. شاری خاربینی گرت. بەڵام بە هۆی گەیشتنی هێزی یەدەگ و چەك و تفاقی‌جەنگی لە رێگای شەمەندەفەرو. خیانەتی یەکێ لە نزیکەکانی شێخ بە ناوی (قاسم جبران ) ی سەرکردەی یەکێ لە عشیرەتەکان. شۆرشەکە شکستی خواردوو. شێخ گیراو لەگەڵ هەڤاڵەکانی هەموو بەیەکەوە رۆژی ٢٧ ی نیسانی ١٩٢٥ لە شاری دیاربەکر لە سیدارەدران. ناوی لە سیدارەدراوەکان : دکتور فوئاد. عالی رەزا بالولی. شێخ شەریف. شێخ عەبدوڵلا. سرمانلی حسین. تیجیکلی شێخ محمد. باڵا زادە بهاءالدین. شێخ ئیبراهیم. جاباقجوەلی طیب. چوڕوملی حەجی حسین. شەریف عبدالرحیم. توفیق ئاغا. کەمال فەیزی بەدلیسی و شێخ عبدالقادر نەهری - سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی تەعالی کوردستان لەئەستەنبوڵ. هەموویان لەگەڵ شێخ سعید لەسیدارەدران.

لەکۆتایی‌ساڵی ١٩٢٥دا شێخ عەبدوڵلای گەیلانی زادە. کوری شێخ عبدالقادری نەهری لەناوچەی نەهری شۆڕشی راگەیاندو. تابورێکی لەهێزەکانی تورك بەدیل گرت. پاشان شۆرشەکە شکستی خواردوو سەرکردەکەشی خۆی هاویشتە عێراق.

لەو ماوەیەدا خالد بەگ جیرانی‌و یوسف زیامەندو بێ پیشووی بەدلیس لەئەنجومەنی نیشتمانی تورك لەگەڵ براکانی علی رەزاو زاواکەیان لەشاری بەدلیس لەسیدارەدران.

ساڵی ١٩٢٦ بروهەسکی تیلی لەخیلی جەلالی.لەچیای ئاگری یاخی بوونی خۆی راگەیاندو رووی کردە چیا. لە ساڵی (١٩٢٧)یش (دانەر)ئیحسان نوری دوای گەیشتنە

ئاگری جلەوی سەرکردایەتی شۆرشی گرتە دەست. لەلایەن کۆمەڵەی (خویبون)یش بەفەرمانەدەی گشتی هێزە چەکدارەکان هەڵبژێردرا هەر لەو ساڵەدا ئالای سێ رەنگی سەربەخۆیی کوردستان کەلە ساڵی ١٩٢٠کۆمەڵەی تەعالی کوردستان پەسندی کردبوو. لەلایەنی خۆیبوونەوە رەوانەی ئاگری کرا. ئیحسان نوریش بۆ یەکەمین جار ئەو ئالایەی لە ئاگریدا بەرزکردەوە.

## ئاگری

**مارشی نیشتمانی ئاگری ئەمەبوو:**
**ئاگری، ئاگری، تۆ ئاگری بووی**
**لە ناڤ گێتی سەر بڵند بووی**
**لەسەر کوردستانێ چرا بووی**
**هەڵبە ئاگری، هەڵبە ئاگری**

وێرای سڵاوو رێزێکی زۆر بۆ تۆ ئەی ئاگری! ئەی چیای سەرکەش ودڵرفێن تۆ هەمیشە قیبلەنمای رۆڵەکانت بووی. ئەوانەی بۆ یادگاری مێژووی پڕ سەروەری ئازایەتیو قارەمانێتی دێرینەی گەلەکەیان دێنە سەردانت.

ئای ئاگری. ناوی تۆ مێژووی مێژینمان دیار دەکات. تۆ هەمیشەو هەر لە سەدەکانی پێشوەوە چاوگی رووناکیو ئاگر بووی. تۆ هەمیشە رەمزی هێزو بەرگری بووی. ئەمرۆش لە کاتێکا مەشخەڵی گرت لە دەروونی رۆڵەکانت تاو دەسێنێ. رێگام بدە وەکو رۆڵەیەکی بەوەفاو گیان فیداکارت. بەرامبەر گەورەییت بێمە کرنوش وچەند لاپەرەیەك لە مێژووی پڕ شانازیت هەڵدەمەوە ئاگری! ئەو چیا سەرکەشەی لای سەرووی رۆژهەلاتی سنوری کوردستانی تورکیا، وسەر لە کەشکەلانی فەلەك دەدات. هەمیشە وەکو دیوارێك نیشتمانی لە هێزو پەلاماری بیانی پاراستووە. ئەو چیایەیە کەتائەمرۆش کەسێك جەسارەتی نەکردووە بکاتە دۆندەکانی.

مەسیحیەکان دەڵێن کەشتی نوح لەوێ لەنگەری گرتووە. بەلام قورئانی پیرۆز دەڵێ لەسەر چیای جود کەدەکەوێتە باشور لەوێ لەنگەری گرتووە. بۆ روون کردنەوەی مێژووی ناوی ئەم چیایە پشتم بە (بەخەچەی رەگەزەکان) لە نوسینی ـ ئە، هارد بەستووە.

ئاگری لەسەر دەمانێکی رابردوودا پەرستگای زەردەشتیەکان بوو. لەم دواییانەش دابوو بەقیبلەنمای لاوە پارتیزانەکانی کورد. کەبۆ ماوەی چەند ساڵێك بەبەرچاوی دوژمنەوە ئالای سێ رەنگی سەربەخۆیی کوردستانی لێ هەڵبکەن.

ئاگری ناویکە مرۆڤی کورد بەناوهێنانی هەست بەشانازی دەکات. هەر لە دێر زەمانیشەوە بەبورکانی تورە ناسراوە. بەوەفاو پارێزەری هەزاران ساڵەی رۆڵەکانیەتی بۆیە ناوی ئاگری هەمیشەو تا هەتایی لە بیرمەوەریو فکرماندا دارێژراوە.

ئاشورییەکان پێیان دەووت (ئورارتو) عبرییەکانیش پێیان دەووت (ئارارات) هیرودۆتی مێژوونووسی یونانیش بە (ئالاراد) ناوی بردووە. بۆیەکەمین جار لە ساڵی ١٢٦٠ (پ.ز)دا مەلیکی ئاشوری (سلمانصر) ناوی (ئورارتو)ی لەسەر بەرد هەڵکەندووە. مێژوونووسی بەناوبانگی دەورگان دەڵێت: دەوڵەتی دەست رۆیشتووی ئارارات دوو هەزار ساڵ لەپێش میلاد دابووە. دۆزراوەئەسەرییەکانی شاری وان و ناوچەکانی دەوروبەری ئارارات و کەناری دەریای رەش ئەو راستیە دەسەلمێنن. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەردوو ناوچەکە ژیاری هاوبەشیان بووە. واتە سنووری دەوڵەتی ئارارات گەیشتۆتە دەریای رەش.

دەڵێن ئاگری لە نەتەوەی گوتی مەزنە. ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتێکی تری هاورەگەزو بنەچەی خۆی وەکو سوباریو نایریبووە لە سەرەتای سەدەی هەشتی (پ.ز)یش دا ژیاری ئاگری گەیشتۆتە ئەو پەری هێزو توانای خۆی.

لەساڵەکانی ٨٢٥ـ ٨٠٠ پ.ز مەلیکی ئاگری ناوی منفاش بووئەوناوە هەر ئەو منفاش چخایەیەکە لە ئاوێستاو منوچکی شاهنامەدا هاتووە. لە لای باشوور بەلاماری هێزەکانی ئاشووربانیپاڵو سلمانصریداو دەستی کوشندەی لێوەشاندن.

دوای ئەوە لەباشوری گۆمی رضائیە لە سەرتابلۆیەك کردەوەکانی خۆی تۆمارکرد. کشایەوە دواوە ئەوکاتە رضائیە پێی دەووترا چیچیس چکس.

هیردوت دەڵێ:ـ جاران هۆزی ئالاروتی وەسەنی لە دەوروبەری چیای ئارارات نیشتەجێبوون. وولاتەکەیان (ئایر) دەگەیشتە سەرئاوی ئاراس. پێشتریش ئەو ناوچەیە وولاتی تایفەی ئاریزانتی میدیبوو. لەوە دەچێ ناوی ئارارات لە ناوی ئەو تایفەیەوە هاتبێت. بوونی ناوچەیەك بە ناوی خالدییەکان لە نزیك ترابزون ئەوراستیە ووتراوە ساغ دەکاتەوە کە سنووری دەوڵەتی ئارارات دەگەیشتە دەریا ی رەش.

بەهێزبوونی دەوڵەتی میدیەکان لە سەر دەستی مەلیکە مەزنەکە هوخشترە هۆیەکی راستەوخۆبوو بۆ لاوازکردنی پایەگاکانی دەوڵەتی ئارارات. سەر دەمانێکیش ئارارات لەلایەن مەلیکەمانەومیەکان حوکم دەکرا. کە وولاتەکەیان لە باشووری رۆژئاوای گۆلی چیچس ـ رضائیەبوو. لەساڵی ٦٠٠ پ.ز خۆر کەلەپایەگاکانی دەوڵەتی ئاراراتیدا. تائەرمەنیەکان دەسەلاتی خۆیان بەسەردا سەپاند. هیرودوت دەڵێ:ـ ژیاری ئاراراتیەکان لەژیاری ئەرمەنیەکان پێشکەوتوو تربووە.

ئەرمەنیەکان ئایینی ئاراراتیان پەسندکرد. دواتر ئەرمەنیەکان ناوچەکەیان ناونا (هایستان) هەروەها خۆشیان ناونا (هایك) حای ئاگریش بوو بەجێژوانی راوشکاری

مەلیکی ئەرمــەنی. چیــای ئاگری. لە پێش یەکەمین جەنگی جیهانیدا پێگەی سنووری روسی- ئێرانی- عوسمانیبوو. دوای دامەزراندنی یەکێتی سوڤیەت ئەرمەنەکان دەستیان بەســەر ئەوناوچەیە داگرت. عوسمانیەکان بەهاوکاری کورد توانیان بیگرنەوە. هەروەها تورکەکان بەوناوچەیە دەڵێن ئاگری. دوای شەڕی ئاگری ناوی (قەرەکوسە) یان بە ئاگری گۆری.

لە سەردەمەکانی کۆن دا کورد بەئاگریان دەووت (ازەر). هەروەها بەو چیایە (مەبەست چیای ئاگرییە)یان دەووت (آزەر). ووشەکە وورده وورده گۆرانی بەسەردا هات و بوو بە (آگەر) ئینجا (ئاگرین). بورکانەکانی ئەوچیایە نیشتنەوەو ساردبوونەوە. ئەمرۆش شاخە مەزنــەکانی هەرچوار لای ئەوچیایە ئەو راستیە دەسەلمێنن کە جاران مەڵبەندی بورکان بووە. هەروەها چیایەکی تری مەزن لە باشووری رۆژئاوادا هەیە کەهەر لە دێرزەمانەوە مەڵبەندی بورکان بووە پێی دەڵێن (تەندوك). لە سەر لوتکەی ئەو چیایە جێگایەك هەیە وەکـو تەندوور. هەڵمێکی گەرمی لێ هەڵدەستێ. هەندێ کورد نەخۆشەکانیان دەبەنە ناو تەنوورەکە دای دەنێن. شفای بۆ دێت و چاك دەبێتەوە.

## برو هەسکی تیلی

برایم ئاغا کە پێیان دەووت بروهەسکی تیلی لە عەشیرەتی جەلالیو لە نەوەی بنەماڵەی هەســسووری بوو. لەئەنجامی ئازایەتیو خزمەتگوزاری لەپێناوی ئازادی گەلەکەی. بووبوو بەنوێنەری گەلی کورد لە هەیئەتیخۆیبوون دواتر نازناوی (پاشایی) یان دایێ. ماڵەکەی لە بناری چیای ئاگری بوو. لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا لەگەڵ گور هەسوقونکی (ئــەویش ماڵەکــەی لە ئاگریبوو) بەیەکەوە بەر پەرچی هێرشەکانی روسیایان دایەوەو نەیــانهێشت بگەنە دۆڵ و شیوەکانی چیای ئاگری. بەڵام روسەکان لەگەڵیان رێ کەوتن لەبری پێدانی شەکرو برنج لەپشتەوە پەلاماری هێزەکانیان نەدەن.

دوای شۆرشی بەلشــەڤ لە روسیــا، هێــزەکــانی روسیــا لەخــاکی دەوڵەتی عوسمانی کشانەوە. چەکدارەکانی ئەرمەن شوێنی روسەکانیان گرتەوە. بەڵام هێزەکانی گور هەسوو بروهەسکی بەرسنگیان لێ گرتن، گور هەسو پەلاماری شاری بایەزیدی داو لە شەرەکانی لەگــەڵ ئەرمــەن دا کوژرا ئیتــر برو هەسکی رابەرایەتی ئیدارەی هێزەکانی ئاگری گرتە ئەستــۆو پەلاماری بایەزیدی داو پێش گەیشتنی هێزەکانی عوسمانی گرتی، پاش چەند رۆژێك عوسمانیەکان گەیشتن و شاردکەیان وەرگرت بروهەسکی خوشکی مەحمودە فەندی سەرۆکی شاردوانی بایەزیدی خواست بۆ خۆی دوکانێکی لە شارکردەوەو خەریکی کاسبی بوو. بەڵام خێزان و منالەکانی تری لە ئارارات مانەوە.

لە سەردەمی شێخ سعیدی گەورەدا هەسکی بێ لایەن مایەوە.

پاش کرسی شێخ سعید. عالی رەزای کوری و چەند پیاو ماقولێکی هەسنی هەوڵیان دا

خۆیان دەرباز بکەن. حکومەتی تورکیاش بەهاوکاری خێڵەکانی کور حسێن پاشاو دەلالی هەوڵی دا ڕێگای پەڕینەومیان بۆ ئێران لێ بگرێت. خۆشبەختانە هەوڵەکەیان سەرکەوتوو نەبوو. ئەوان لە سنوور پەڕینەوەو چوونە دیوی ئێران. دوای شکستەکەی شۆڕشی شێخ سعید. حکومەتی تورکیا سەرۆکی خێڵە کوردەکانی لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیان دوور خستەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ.

خزم و کەس و کاری برو پەیوەندییان پێوە کردو پێشنیاریان کرد پێش ئەوەی حکومەت دەستی بۆ درێژ بکاو دووری بخاتەوە. ئەوان دەربازی بکەن، بەڵام برو وەڵامی دانەوە:ـ خزمەتێکی زۆری حکومەتی تورکیام کردووە ئەمڕۆش من بۆ خۆم خەریکی کاسبیم هەقم بەسەر هیچەوەنیە. دۆستی دەوڵەتم. ئیتر بۆچی دەتانەوێ دەربازم کەن؟ هەرگیز ئەوەی بەبیردا نەدەهات کە کورد. چ ئەوانەی خزمەتی دەوڵەتی تورك دەکەن یان نایکەن لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە بەیەك چاو سەیر دەکرێن.

سەر لەبەیانی ڕۆژێکی کۆتایی ساڵی ١٩٢٦ کاتێ منداڵەکانی برو لە گوندی (سفلك) لە چیای ئاگری تازە لە خەو هەڵسابوون دەستیان کردبوو بەرادانی مەرو ماڵاتەکانیان بۆ لەوەڕگاکان. دەربارەی ئەو ڕووداوە بوو بە خۆی بۆی گێڕاینەوە:. ڕۆژێك (ئێلخان)ی کورە گچکەکەم زۆر بە پەلە لە ئاگرییەوە هات بۆ لام. ئەو وەختە من لەماڵەکەی خۆم بووم لە بایەزیدو نانم دەخوارد. کورەکەم پێیووتم : ٣٠ سوارەی تورك لەگەڵ ئەفسەرێك هاتن بۆ گوندو لەگەڵ کازیوەی بەیانیدا لە تۆیان پرسی. خزمەتکارێکمان نارد بەدوای ئەسپەکەتا بگەڕێت. خزمەتکارەکەش دوای بەدیکردنی ئەسپەکە سوواری بوو لەرکێبیدا. هەندێ لە سوارەکانی تورکیش دوایکەوتن کاتێلە گردۆلکەکان ونبوون دەنگی چەند تەقەیەك هات. دایکم بە ئەفسەرەکەی ووتبوو. برو لە گوندنیە بەڵام نەمانزانی سەرەنجامی تەقەکان چیبوو.

بە کورەکەم ووت: بە پەلە بگەڕێرەوە گوند بە سوارەکان بڵێ باوکم چۆتە (قیزل دزی). بەڵام من ڕێگای (قوتیس) دەگرم. لە یادت نەچێت تفەنگەکەم بۆ بێنە کەناری ڕووبار ئەو ڕۆیشت. منیش هاتمە دەرەوە. لە پێش مزگەوت ڕوو لەڕووگە(قیبلە) ڕاوەستاوم. گووتم: خوایە تۆ دەزانی من چ خراپەیەکم بەرامبەر دەوڵەت نەکردووە. من لە نێو شاری بایەزیدم .ئەوان چووینە گوندو لەمن دەگەڕێن ئەمەش لوتفی تۆیە .ئەتۆ تفەنگەکەم بگەیێنە دەست ئیتر هەرچی دەبێ بابێ.

لە شار چوومە دەرەوە و ڕێگای (قوتیس)م گرتەبەر تا گەیشتمە کەناری ڕووبارەکە. لە دوورەوە مێگەلەکەی خۆمانم بە دیکرد. چووم بۆ لای شوانەکەو پرسیم: چیبووە؟ ووتی:. سەربازەکان هاتن بۆ گوند. تۆیان نەدیت. کاتێ چاویان بە ئەسپەکەی تۆ کەوت دوای کەوتن لە ڕێگادا تووشی هەندێ سەربازی ڕاکردوو بوون لە خێڵی کەسکویی .تەقە لە

له نێوانیاندا بەرپابوو یەکێك له
سەربازەکانی تورك بریندار بوو .یەکسەر ڕەوانەی گوندم کردەوە .گەرایەوەو تفەنگەکەی
بۆ هێنام و ووتی:. سوارەکان بریندارەکەیان له ماڵی ئێوە جێ هێشتووەو خۆشیان
ڕۆیشتوون . برو لەگەڵخزمەتارەکەی گەرایەوە گوندو بریندارەکەی لەگەڵ دوو کەس دا
ناردەوە بایەزید .کات کۆتایی زستان بوو. هێشتا ئاگری بەرگی سپی فرێ نەدابوو .دەڵێن
جلو بەرگی ئافرەت و منداڵانی کورد بەنوکی ڕمی تورك لەت لەت و بەودەشتەدا
بڵاوکرابوویەوە .باڵندە گۆشت خۆرەکان لاشەی ناسکیانی کون کون و پارچە پارچە
دەکردن ئاگریش لەناو هەورا چاوی لەو قەسابخانە خوێناوییە ترسناکەی ئەو باشە
تاوانکارەکان بوو و دنیای بەلەعنەت دەکرد .وورشە وورشی زریان و ڕەشەباش بەیەکا
هەڵدەشاخان و ترسێکی زیاتر یان دەخستە شوێنەکە جار جارەش بێدەنگییەکی ترسناك
وەك بێدەنگی گۆرستان ناوچەکەی لەئامێز دەگرت.
ئاگری نارەزاو تووڕە بوو .زمان حاڵەکەی دەیووت:
ئاگرت داباراندە بان سەران
بەگری خۆت هەموو جێگایەکت ڕۆشن دەکردەوە
جار جارەش زەویت دەهەژاند
داگیرسێ ئەی ئاگری .داگیرسێ ئەی ئاگری
لەپڕ هەندێ تەقە لە لایئەوسوارانەوە پەیدابوو کە دوای ئەسپەکەی بەرو کەوتبوون .لە
نزیك گوندی (جەبە کونیەتی) چەند دەستڕێژێك ڕووبەرووی یەکترکرا .لە گوندەکە
هەندێ سەربازی راکردووی خێلی کەسکۆیی هەبوو .ڕووبەرووی سەر بازەکانی تورك
وەستان و یەکێکیان لێکوشتن و یەکێکی تریشیان لێ بریندار کردن .لە ڕەفتاری کوردا وایە کە
دەبێ دوو قات تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە .ئەو کوژراوە یەکەمین قوربانی دوژمن بوو لەو
ڕاپەرینە خوێناوییەدا .تورکەکان دەرکیان بەومنە .کرد .کە ئەشکەوت و دۆڵە قوڵ و
تاریکەکانی پشتی لوتکە و تیپشە بەرزە ترسناکەکان بێشەی شێرو پڵنگە. هوشیار کردنەوە
یان کارێکی خەتەرناکە
ئەوژەمی بیرەوەریەکانی گەنجێتی ئاگری ڕاهەژاند .بەرگی سپی خۆی دادری .هەروەکو
ئەسپی ڕەسەنی عەرەبی .چۆن لەگەڵ دەنگی تەپڵ دەکەوێتە سمکۆڵ چۆن وا دەزانێ
دەنگی تەپڵی شەرو نزیکە بەرەو غەزا بروات . ئاگریش باوەشی دایکایەتی خۆی بۆ
پێشوازی رۆڵە شەرکەرە قارەمانەکانی خۆی کردەوە .وەکو خەنجەرێکی چەقیو لەسنگی
دوژمن وەستابوو .و گوێی بۆ گۆرانیە نیشتمانیەکان هەڵخستبوو کەگەنجە کوردەکان
دەیان ووتەوە بەمەش مەغروورو لە خۆرازیتر دەبوو دانیشتوانی گوندەکانی بناری
ئاگری گوندەکانیان چۆڵ کردو بە دۆندە مەزنەکانی ئاگریدا هەڵگەران. ئەفسەرە تورکەکە
پێی وابوو دەتوانێ بروهەسکی بخەڵەتێنێو لەلانەی خۆی بێتنێتە دەرەوە بۆیە یەکێکی

ناردە لای برو ئاگاداری کرد. کەدمیەوێ لە گوندی (هەلاج) بیبینێ ودەربارەی هەندی شت گفت و گۆ بکەن .

برو لەبابەت ئەم چاوپێکەوتنە دەیگوت :-

لەدڵی خۆم دا ووتم: شەیتان لەبن گوێی ئەو تورکانەی خوێندووە .دەترسم قسەم بۆ بکەن وبم خەڵەتێنن .بروایان پێ بکەم و بەدەم قسەکانیانەوە بچم .سەرەنجام چووم . بە تەرجومانەکەم ووت :- قوماندار هەرچی گووتی وا بۆمن تەرجوومەمەکە .شتی‌تر بڵێ .ئەفسەرەکە زۆری گوت .بەڵام تەرجومانەکە قسەکانی ئەوانی بۆ کورت دەکردەوە .دوای ئەو هەموو قسانە ئەفسەرەکە ووتی:-چ دەڵێی برایم ئاغا؟ وەڵامم دایەوە:- من هیچ لە قسەکانی تۆ نەگەیشتم .بە راستیش وابوو .دوای ئەوەی تێگەیشت کە قسەکانی هیچ سودێکیان نیە ووتی ؟ئێمەو ئێوە موسڵمانین. پیاوەکانت ناردۆتە شاخ و دزی دەکەن .ماڵی موسڵمانان تاڵان دەکەن .ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە .لە یاسایاخی مەبن بگەڕێنەوە گوندەکانی خۆتان و لەگەڵ ژن و منداڵەکانتان بە خۆشی بژین. تەرجومانەکە قسەکانی بۆ تەرجومە کردم .ووتم: بە ئەفسەرەکە بڵێ ئەم قسانەی تێ گەیشتم من مل کەچی دەوڵەت بووم .هەموو ئەرکەکانم جێبەجێ دەکرد. لەماڵی خۆم لەنێو خزم و منداڵەکانی خۆم بەختیار دانیشتبووم. دوکانداریێتی خۆم دەکرد .بەڵام ئێوە واتان کرد لە خزم و منالەکانم دوور بکەومەوە بۆچی ؟ ئەوە زوڵمە دەوڵەت بەرامبەرمان دەکات .بۆ ئەوەی ئەو زوڵمە لەسەر خۆمان لابەرین گوندەکانمان چۆڵکردو رووومان کردە ئەو شاخانە . دەوڵەتی ئێوە نەیهێشت ئاسودە دانیشم. خەریکی کاروباری خۆم بووم لە پێناوی تێر کردنی زگی ژن و منداڵەکانم .ناچارم مردنی خۆم لەبەر چاو نەگرم. بەڵکو پەزێك بەدەست بێنم زگی برسی تێر بکەم. بەڵام ئێوە کاربەدەستانی دەوڵەت لەپشتی مێزو لەسەر کورسی دانیشتوون .بەرەکەتی گیرفانی میللەت و کاسەی دەوڵەت بەتاڵ دەکەن .بەویژدانت کێ لە ئێمە دزی گەورە دەکات . کامەمان گوناهمان زۆرترە .

ئەفسەرەکە سەیری کرد برو فێڵی لێ ناکرێت. بۆیە سەربازەکانی خۆی هێناو لەداوێنی ئاگری چادریان هەڵدا. هاوسەنگەرانی‌برو زۆر کەم بوون . چاوەڕوانی دەست بزاوتنی عەسکەربوون .بەڵام نەیان زانی‌بوو ناحەز شەو چادرەکانیان بەڕوناکی هێشتوتەوەو تریسکەی ئاگر نەکوژاوەتەوەو سوودیان لە تاریکی شەو وەرگرتوەو لەئۆردوگا هاتونەتە دەرەوەو دەوری ئەوانیان گرتوەو پەناگەی برویان گەمارۆ داوە.دنیا تازە رووناك ببوو کە دەنگی تۆپ وتفەنگ و مەترلۆز بەرز بووەوە گوللە بە سەر کوردەکاندا دە باری برو نەشلەژا خۆی گرتوزانی چی‌بووە هێزەکانی برو کەلەدوو برای دوو برازای. ٣کوری خۆی‌و هەندێ لە کورە مامەکانی. لەگەڵ ژمارەیەك شەرکەری خێڵی هەسی‌سوری‌و کۆمەلێك لە خێڵی موسی پیرکی‌و پیاوەکانی محو بەکرو هەندێ شەر کەری خێڵی کە سکویی پێك هاتبوو.

هەمــوو تاویان دایە تفەنگەکانیان و روو بەرووی دوژمن بوونەوە. شەر گەرم بوو. دەنگی تۆپ و ناڵە ناڵی گوللە ئەو چیــایــەی دەلەرزانــد، ئاگری بینی کە ئەحمەد ئاغای جەنگاوەری برای برو برایەکی محـو بەکر شەهید بوون. برو هەسکی خۆشی بریندار بوو. لەگەڵ ئەوەش دا هێزەکانی دوژمن تێك شکان و بە پەلە پڕوزێ کشانەوە. لە پاش خۆیان تفەنگێکی زۆرو تۆپیان بەجــێ هێشت. ژمارەیەکیشیان بە دەست هێزەکانی کورد بە دیل گیران. لەبەر ئەوەی کوردەکان ویستیان تورکەکان تێ بگەیەنن کە کورد قیزی لەدیل کوشتن دەبێتەوە. شەرەف و کەرامەتیان رێگا نادات دیل بکوژن. بۆیە هەموویان ئازاد کردن.

دوای ئەوەی کوردەکان دەستیان بەسەرمەیدانی شەرو چەکی هێزەکانی دوژمن داگرت. بەهــۆی نەبــوونی شارەزا لەبــەکار هێنانی تۆپ و سود لێ وەرگرتنی تۆپەکانیان بەجێ هێشت، ئەفســەرە تورکــەکەش بۆ ئەوەی ئارەقەی شەرمەزاری شکست و راکردن لە نێو چاوانی خۆیی و هێزەکەی بسڕێتەوە. بەهاوکاری دانیشتوانی رۆژ ئاوای ئاگری کەلە ژێر دەسەڵاتی رژێم بوون.

...تەو دزەیان کردە شوێنەکانی شەرو. هێندێ بۆیان کرا چادرو تۆپەکانیان بردەوە. کاتێ چەکدارەکانی برو هەستیان پێ کردن دوایان کەوتن. بەڵام کار لە کار ترازا بوو. چونکە لە سنووری دەسەڵاتی ئەوان دەرچوو بوون. چەکدارەکانی برو ساڵی ١٩٢٦ یان لە قەد پاڵی ئاگری بەسەربرد. بێ ئەوەی دوو چاری هیچ تەنگ و چەڵەمەیەك بین. لەو کاتەدا سەرۆك خێڵێ شەمکان تەمر شەمگی نیشتەجێی ناوچەی (توزهە) بوو هاتە ئاگری. تەمر شەمکی پیاوێکی ئازاو کوردێکی زرنگ و هەمیشە ئامادەی گیانفیدا کاری بوو لە پێناوی ئازادی نیشتمانەکەی دا. لە نێو هەڤاڵەکانی بەدلێروجەسوور ناسرابوو. لەگەڵ هاتنیا (شارخو) ی براشی لە گەڵدا بوو.

کەش،سەرەتای بەهاربوو. چیای ئاگری وەك دایکێکی میهرەبان رۆڵەکانی خۆی دەگرتە باوەش و دەیپــاراستن. گردو لاپــاڵ و نشێــوەکانی خۆی بەبەرگی سەوز رازاندبۆوەوە. شانازی بەبەچکە شێرە قارەمانەکانی باوەشی خۆی دەکرد.

کاتێ تورکیا سەرکردە کوردەکانی نەفی کرد. شێخ عبدالقادر کەسەرکردەیەکی خێلی ساکان بوو. لە چیای ئاگری لەگەڵ خێزان و مناڵ و کەس و کارەکانی خۆی دەژیا. دەوڵەت گرتی و. بۆ ناوچــەی ئەزمیر دووری خستەوە. بەڵام هێندەی نەخایاند لەگەڵ صالحی برازای بەجــووت رایان کردو. خۆیان گەیاندەوە ئاگری دوای گەیشتنی بەشێك لەهۆزی ساکان کەلە ئاگــری بوون. هەمــوویان پەیوەندیان پێوەکرد. بۆیە کرا بە فەرماندەی هێزەکانی رووکاری ساکان.

گەرمــایی کەوتــەوە جەستــەی ئاگری. ئیتر توانای ئەوەی پەیدا کردەوە. کە زۆر بە خۆشییەوە پێشوازی لە میوانەکانی بکات. هەرواش بوو. سەر لەبەیانیەکی زوو هەموو

دانیشتوانی شاری بایەزید. لەگەڵ تەقەی تفەنگی دەستی ئاگری بە قارەمانەکان لە خەو راپەڕین.

تورکەکان دیعایەی وایان بڵاو کردەوە کە هەندێ ڕێگر پەلاماری شاریان داوە. شەر تا ئێواری خایاند. پاشان هێزەکانی ئاگری کشانەوە شاخ هەر لەو شەرەدا. بروهەسکی لەگەڵ چەند چەکدارێك.

خۆیان گەیاندە رابیعە خانمی ژنە گچکەی کەتا ئەو رۆژەش هەر لە شاربوو. دەربازیان کرد. لە ئەنجامی ئەو راپەرینە حکومەت لەرزی لێ نیشت. بریاری دا بەهەچ نرخێك بێت ئەو راپەرینە خامۆش بکات.

سەرەتای پایزی سالی ١٩٢٧ هێزێکی تورك بەنیازی سەرکوت کردن و بڵاوە پێ کردنی کوردەکـان. پەلامـاری چیـای ئاگـری یان دا. دانیشتـوانی باکـوری ئاگـری لایەنگیری حکومەتیان دەکرد. هێزەکانی حکومەتیش لەو قۆڵەوە هێرشەکانی خۆیان دەست پێ کردو هەندێ لە قوتەکانی نێوان ئاگری گەورەو ئاگری بچوکیان گرت و چادریان لێ هەڵدا. ئیتر شەر دەستی پێ کرد.

جەنگـاوەرەکـانی ئاگری ژن و منالەکانی خۆیان رەوانەی ناوچەی (تامبات) کرد. کە دەکەوێتە سنووری دەسەلاتی خێلی ساکان لە ئێران. پشتیان لە سنووری ئێرانی بێ لایەن کردو. رووشیان لە هێزەکانی تورك.

هەر زوو دەستــەیەك لە پێشمەرگە قارەمانەکان بە بەرزاییەکانی چیایەکە هەلزنان و. خۆیان گەیاندە پشتی هێزەکانی دوژمن. ئیتر ئاگری شەر داگیرسا.

هەندێ لە کوردەکانی خێلی ساکان لە ئێران بەهانای براکانیانەوە چوون. بەم جۆرە، دوژمن شکستی خواردوبەرەو قولایی کشایەوە. بەلام هەندێ لە هێزەکانی تورك لە سەر هەنـدێ ملە مابـوونەوەو بەردەوام بوون لە شەر کردن. بەمەبەستی شکاندنی ئابلوقەو گەیشتنــەوە بەهێـزە کشـاوەکەیان چەند هێرشێکی توندیان کرد هێزە مول خواردوەکەی رووکاری رۆژ ئاوای ئاگریش بارمەتی دان و بەهانایانەوە هاتن. شەر گەرم بوو کورە ئازاکانی ئاگری بەدەروونێکی گەرم و ئازایەتیەکی

بێ وێنە بەرسینگی هێزەکانی دوژمنیان گرتبوو. هەوای ناوچەکەش وورده وورده گۆراو. هەورێکی رەش بەری ئاسمانی گرت و لوتکەکانی داپۆشی. بارانێکی زۆر دایکرد. بەم جۆرە ئەم قەسابخانە ترسناکە لەبەر چاوان وون بوو. ئاگری بەدەم هاواری رۆڵەکانیەوە هات. جەنگاوەرە کوردەکان سودیان لەو هەلە وەرگرت و. هێرشێکی کوشندەو کاریگەریان کردە سەر دوژمن. کاتێ هەورو مژەکان رەوینەوە.

دەرکەوت هێزەشکاوەکەی دوژمن دەمیان قوچاندو هەر بابا بوو خۆی دەرباز دەکرد لە ئەنجامی ئەو شەرەدا پێشمەرگەکان چەکێکی زۆری دوژمنیان دەسکەوت بوو ژمارەیەکی زۆریشیان لە هێزەکانی دوژمن بەدیل گرت.

کە چەند ئەفسەرێکیان لە ناو دابوو. بە هۆی ئەوەی کوردەکان ئازووقەیەکی ئەو تۆیان

نەبوو دیلەکان بەخێو بکەن و کەرامەتیشیان ڕێگای ئەوەی نەدەدان بیانکوژن.

بۆیە دوای ٢٤ سەعات هەموویان ئازاد کردن و. ڕەوانەی بایەزیدیان کردنەوە. ئەو سەرکەوتنە بە ئاشکرا بە رووی جەنگاوەرەکانی ئاگرییەوە دیار بوو. هەر وەکو بڵێی دەنگێك لە غەیبەوە بانگی لە ئاگری دەکردو دەیووت:

**شیوو دۆڵەکانت پڕ بوون لە خوێن**
**لاشەی کوژراوەکان لە هەموو لایێ کەوتوون**
**ڕاستە تۆ پێشان ئاگری بووی**
**بەلام ئێستا. ڕۆڵەکانت ئاگرن.**

پێش ئەوەی هێزە شکست خواردووەکەی دوژمن بە تەواوی لە ئاگری بکشێنەوە. زانیان کە ئیحسان نوری لەناو کوردەکانی ئاگری دایە. ئیحسان نوری لەگەڵ ٢٠ سوارەی خێلی حەیدەری. کە یەکێکیان لەوانە پورزاکەی سیف الدین بەگی کوری سەرۆکی پێشوو وفتح الله بەگ بوو. لەگەڵ هەندێ لە چەکدارەکانی خێلی هەستی. لە سنووری تورکیاوە پەڕیبوونەوە بۆ سەردانی خێلی حەیدەران و هەسنان بەمەبەستی هەواڵ پرسین و ئاگاداربوون لەچۆنیەتی ژیانیان. لەنزیك گوندی .(خەنس) هەواڵی هێرشەکەی دوژمنی بیستبوو بۆ سەر چیای ئاگری. ئیتر هەر لەوێوە یەکسەر لەگەڵ چەکدارەکان ڕوویان کردبووە ئاگری.

ئیحسان نوری کێ بوو؟

ئیحسان نوری لە کوردەکانی بەدلیس و. لەخێلی جبران بوو. ئەفسەرێکی کورد بوو لەسوپای تورکیا. ماوەی چوار ساڵ فەرماندەی هێزە .سنووریەکانی تورکیا ـ ئێران بوو لە بایەزید. زۆر بەچاکی شارەزای ناوچەی ئاگری بوو.

ساڵی ١٩١٩ ئیحسان نوری یەکێك لەنوێنەرانی حامیەی ئەستەنبول بوو بۆ پشتیوانی کردنی مستەفا کەمال پاشا. ئەو کۆمەڵە ئەفسەرە هانی سوپایان دا تا لە حکومەتی فەرید پاشا یاخی بن. کەدژی هێزە نیشتمان پەروەرەکان بوو. ئەو کارەبوو بەهۆی ڕوخساندنی بەپەلەی حکومەتی فەرید پاشا. ناوی ئیحسان نوری لەئەنجامی چالاکییە گرنگە سەربازی یەکان ودارشتنی نەخشەی سەربازی. لەکۆبوونەوەکانی شاری ئگدروسیرت، لەریزی سوپای تورك بڵاوبووەوە.

دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا ئیحسان نوری زانی سەرکردەکانی حکومەت نکوڵییان لەبەڵێنی ئازادیو سەربەخۆیی کوردستان کردوە. کەپێشتر بەکوردەکانیان دابوو . لەئەنجامی کاردانەوەی هەڵوێستی سلبی حکومەتی تورکیە ساڵی ١٩٢٤ لەگوندی (بیت الشباب) ی نزیك سنووری عیراق بەنهێنی هێزێکی عەشایەری دامەزراند. بەهاوکاری

چوار ئەفسەری کورد (رامی راسم ـ خورشید ـ عالی رەزا) فەرماندەیەتی هێزەکەی گرتە ئەستۆ. یاخی بوونی خۆی لەدەوڵەتی تورکیا راگەیاند. بەڵام ئەو راپەرینە ئاگرەکەی زوو کزبوو وکوژایەوە عالی رەزا بەدیل گیرا و کەوتە دەست تورکەکان.
هێزێکی سەربازیم لەگەنجە کوردە پارتیزانەکان پێك هێناو ئالای کوردستانمان لە دو ندی ئاگری هەڵکرد. شەکانەوەی ئەو ئالایە ترسێکی زۆری خستبووە دڵی هێزە شکست ومول خواردووەکەی تورك لەشاری بایەزید. پارێزەرانی قارەمانی ئاگریش بە دەنگی دلێرانەی خۆیان هەموو ناوچەکەیان هێنابووە لەرزین.
دروشمیان دە ووت و چەپلەیان بۆ ئالاکەیان لێدەدا. ئەوێ رۆژێ لەپاڵ رێکخستنە سەربازیەکان ئیدارەیەکی مەدەنیشمان پێك هێنابوو. ئالای کورد دەشەکایەوەو باشوری ئاگریش هاتبووە ژێر فەرمانرەوایەتی ئیدارەی کوردستانی ئازاد.
ئەو سەرکەوتنە مەزنە مژدەیەکی خۆش بوو بۆچەنگاوەرەکانی ئاگری. بەدەنگە دلێرەکانی خۆیان ئەو چیایەیان دەلەراندەوە. سرودە نیشتمانیەکەی خۆیان دەووتەوەو دەیان ووت..

بالت بەسەر رۆژهەلات ورۆژئاوا داکێشایەوە
بالت بەسەر رۆژهەلات ورۆژئاوا کێشایەوە
سنگت گری لێ دەرژێتەوە
تۆ هەمیشە کەعبەی کورد بووی
داگیرسێ ئەی ئاگری . داگیرسێ ئەی ئاگری.

شۆرشگێرە کوردەکان ئەرکی سەرپەرشتی دروست کردنەوەی گوندەکانی ناوچەکە یان گرتە ئەستۆ. کاتێ ئاگری شەر لەئاگری گڵپەی سەندبوو . لەهەمان کاتدا. لە جێگایەکی دوور کۆنگرەیەکی گەورەی نەتەوەیی کورد پێك هاتبوو. وکۆمەڵەی ـ خویبوون ـ سەربەخۆیی ـ یان راگەیاندو . ئیحسان نوریشیان بەفەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان ولێ پرسراوی کاروباری جەنگی هەڵبژاردبوو.
تێکۆشەرە کوردەکان لەهەموو لایەکەوە دابارینە چیای ئاگری . فەرزەندە بەگ لەخێلێ هەسنی ـ کەلە سەردەمی شۆرشی شێخ سەعیدی گەورە شاری (مەلازگەرت)ی لە دەسەلاتی تورکەکان رزگار کردبوو ـ لەگەڵ کاظمی برای وئامۆزایەکیو وچەند چەکدارێکی ئازای هەسنی پەیوەندیان بەئاگری یەوە کرد هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردە کوردەکانی وەك: ـ خالص بەگی کوری عبدالمجید بەگی سپکی. تاژ دین بەگ لەسەرکردەکانی خێلێ زەرکی. ئەدو عەزیز حەیدەری لەسەرکردە ئازاکان.
ئەحمەد حاجی برو لەگەڵ هەندێ لەبراکانی. سەید عبدالوەهاب ئەفەندی لەگەڵ ئامۆزاکەی سەید رەسول بەرزنجی.
کەلە

دوور خراوەیی ئەزمیرەوە رایان کردبوو. یەك لەدوای یەك گەیشتنە ئاگری هەسکی بەوالی ئاگری و. تەمر شەمکی بەفەرماندەی هێزەکانی ژاندارم هەڵبژێردران. لەو کاتەش دا نیشتمانپەروەرانی کورد بەشادمانی مارشی ئاگرییان دەچری ودەیان ووت:ـ

**ئەمڕۆ دیسان تورەیی تۆ هەلایسا**
**ئەم ئاگرانە بونە قەڵات**
**ئیتر لە سەر تۆ کۆڕیان بەست**
**داگیرسێ ئەی ئاگری، داگیرسێ ئەی ئاگری**

ئەیوب ئاغا لە سەرکردەکانی خێلی قوتان دوای دوورخستنەوەی برا گەورەکەی بۆ رۆژئاوای ئەنادۆل.لەگەلْ چەند کەسی خزم و دۆست و پیوەندەکانی خۆی لە بەشی باکوری ئاگری پەنایان بردبووە (کەلەفەی کورخان )کەوتنەبەرپەلاماری تورکان چەند سەعات شەریان کرد. هێرشیان بردە سەر تورکان . هێزی تورك چەند کەسێکیان لیکوژراو بریندار بوو. هەندێکیشیان لێ بەدیل گیرا. تورکەکان بە ناچاریو.لە ژێر کاریگەرلێتی گورزی کوردەکان پاشە کشەیان کرد. ئەیوب خان پەیوەندی بە هێزەکانی ئاگرییەوە کرد. ئیتر بەم جۆرە باکووری ئاگریش کەوتە ژێر دەسەلاتی نەتەوەییەکوردەکان هێزەکانی ئاگری بەهێزتر بوون. دانیشتوانی شاری بایەزید بو سووتاندن سوودیان لە قامیشەکانی دەوروبەری ئاگری وەردەگرت.ناچار بوون باج بدەن و لە کۆمەلەی نەتەوەیی کوردانی ئاگری ئیزن وەربگرن تا بە ئازادی نزیك سنووری ئاگری ببنەوە و قامیش ببرن و لە پشتی کەرەکانیان بار بکەن و بیبەن.

دەولەتی تورك. سەربارەی ئەو هەموو هێزە تێگەیشت کە بەشەڕ هیچی بۆ ناکرێت. بە تایبەتی لە کاتێکا کەمن ئیدارەیەکی کوردیم لە ئاگری پێکهێنابوو. بۆیە بە مەبەستی رووخاندن و تێکشکاندنی هێزەکانی ئاگری و ئەنجومەنە نەتەوەییەکەی. کەوتنە فێلْ و تەلەکەبازی. یاسایەکیان بۆ ئەو مەبەستە دارشت بە ناوی (قانون التعجيل ) وئەنجومەنی بالآی تورکیاش رەزامەندی خۆی لەسەر ئەو یاسایە دەربری. بە سەرانسەری کوردستاندا بلاوکرایەوە. بە پیاوێکی ریش سپیش دانەیەکیان بۆ ئێمە ناردە ئاگری تاکو لێی ئاگاداربین. دوای بریاردانی ئەو یاسایەلێبوردنێکی گشتیشیان بۆ هەموو ئەو کەسانە دەرکرد کەخراپەکاریان بەرامبەر بەدەولەت کردبوو.

هیوایان وابوو رۆلەکانی ئاگری چالاکیەکانی خۆیان بوەستێنن و سوود لەو بریارە وەربگرن و مل بۆ دەولەت کەچ بکەن. منیش ووتم ئەوە بەشێکە لە فێلەکانی رۆم. بروا مەکەن. لێ بوردن نیە. برایەکی زۆر موسلمانی برو هەسکی هەبوو (*) ووتی:

تورکەکان کافر بوون. ئەوانەش تەسلیمیان بن وەکو ئەوان کافر دەبن و تەلاقیان دەکەوێت.

(*) ئاراراتیەکان پێیان دەووت (سۆفی) بەلام ناوی ئەیوب بوو.

کاتێ سەرکردەی خێڵەکانی کورد زانیان دەوڵەت زیندانیەکانی بەرداوەو ڕێگای دوور خرا وەکانی داوە بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان. ئەو کاتە بروایان بە بڕیارەکەی دەوڵەت کرد. دەوڵەت گلەییو شکاتەکانی دانیشتوانی ئاگری ڕەچاوکردو. خەڵکی تریشی ئازاد کرد. سەربــاری ئەوەی نوێنەرەکانی دەوڵەت لە نێو دانیشتوانەکانی ئاگری پڕو پاگەندەیان دەکـرد. ـ پەیــوەندیشیان بەئیحسان نوری و شێخ عبدالقادر کرد. کە خێزانەکانیان بۆرۆژئاوای ئەنادۆل دوور خرابوونەوە. لە گەڵیاندا کەوتنە گفتوگۆو بە ناوی دەوڵەت پێیان ووتن: ئەگەر بگەڕێنەوە ژێر دەسەلاتی دەوڵەت ژن و منالەکانیان ئازاد دەکرێن و بەیەکەوە شاو شوکردەبنەوە. پێشنیارەکانی دەوڵەت لە لایەن ئیحسان نوری ڕەت کرایەوە. بەلام شێخ عبدالقادر لەگەڵ ئامۆزاکەی گەڕانەوە بایەزیدو خۆیان تەسلیمی دەوڵەت کرد. دەوڵەتیش ویستی دۆستــایــەتی شێــخ عبــد القادر لەگەڵ بروهەسکی بقۆزێتەوە بۆیە داوایان لە شێخ عبدالقادر کرد لەگەڵ نوێنەری دەوڵەت بچنە ئاگری بۆ قەناعەت پێکردن و گەڕانــەوەی بروهــەسکی. دیارە بەمەبەستی خەڵەتاندن گفتی هەندێ قسەی خۆش و بەڵێنیشیان بۆ ناردبوو. بەلام کاتێ ئاگرییەکان بەمەیان زانی ڕێگایان لێگرتن و نەیانهێشت بگەنە ئاگری. ناچاریان کردن بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی لێی هاتبوون.

دەوڵەت دەیگوت: .واز لە شەڕ بێنن. مل کەچی دەوڵەت بن سوود لەو بڕیارە وەربگرن. ئیدارەی ئاگریش وەلامی دەدانەوە: ئەگەر دەوڵەت ڕاست دەکات. باسەرکردە کوردە دوور خراوەکــان ئازاد بکــات و. ڕێگــایان بدات بگەڕێنەوە شوێنەکانی کۆنی خۆیان.ئەو کاتە بەقسەکانیان بڕوا دەکەین. هێندەی نەبرد خێزان و منالەکانی شێخ گەڕانەوە. سەرکردە کوردە دوور خراوەکانی ئەناوۆلیش ئازاد کران و گەڕانەوە گوندەکانی خۆیان. بە پێی ئەو یاســایــە کوردەکــان خۆیــان ڕا بە دەستــەوەو گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان. هەروەها هەندێکی تر لەوانەی کە پەنایان هێنابووە بەر ئاگری شوێن پێی شێخ عبد القادر کەوتن و گەڕانەوە بایەزید.دەوڵەت نەك هەر چەکی نەکردن بەڵکو دیاریشی پێدان. هەروەها لەسەر داواکــاری سەرکــردەی نیشتمــانیی کوردو. بەمــەبــەستی بلاوکــردنــەوەی ڕێکخستنی (خۆیبون) لەسەرانسەری کوردستان دا.سید عبدالوهاب بەرزنجیو نەمر شەمکی ئاغاش تەسلیم بەدەولەت بوونەوە ئەو دوو سەرکردەیە لە کوردە هەرە گیانفیداکارەکان بوون. ئەبوایە یەکێکیان لە ناوچەی ئەرجیش و ئەویتریان لە ناوچەی تۆزلوج و فاخر مان کاربکەن.

گیانی نیشتمان پەروەری بەشێوەیەکی ئەوتۆ لە دەروونی هەندێ لەسەرکردەی هێزە گیــانفیــداکــارەکــان تاوی سەنــد بوو کە خۆ بەدەستەوەدانیان پێ کفر بوو. بۆیە هیچ بایەخێکیان بەیاسای تعجیل نەدا.

هەرلەوکاتەدا سەرکردەی نیشتمانی کورد لە ئاگری چاوی بە نوێنەری ڕەسمی کۆمەڵەی (تــاشنــاف)ی ئەرمەنیەکان کەوت. چونکە کۆنگرەی کورد هەوڵ دەدا لەگەڵئەرمەنیەکان

یەکبگرن کۆششیان یەکبخەن بۆ رووبروو بوونەوەی دوژمنی هاوبەشی. کوردو ئەرمەن بەو هەنگاوە زۆر خۆشحاڵ بوون. نوێنەری ئەرمەنەکان بەناوی (ئەردەشێر موورادیان) بوو. خەڵکی گوندێکی مەسیحی بوو لە نزیک خنس. ووریاو نەتەوەییەکی پاك بوو. لەناو کوردەکانی زیلانیش ناسرابوو. هەندێ پێیان وابوو مێوانداری کردنی نوێنەری ئەرمەنیەکان لە لایەن سەرکردەی کوردەکان دەبێتە هۆی ئەوەی هێزە چەکدارەکانی هەردوولا یەکبگرن. بەڵام راستییەکان بەو جۆرە نەبوو.

خۆ بەدەستەوەدانی هەندێ لە کوردە کۆچ پێکراوەکان و. سەرەنجامی یاسای تعجیل. تەئسیرێکی سلبی زۆری کردە سەر ژمارەی هێزەکانی ئاگریو کەمی کردنەوە. دووچاری قەیرانێکی توندی کردن لە رووی ئازووقەو خواردنەوە. بەڵام تەئسیری نەکردە سەر هەڵوێستیان لە بەرامبەر رۆم. کات زستان بوو. بەفر ناوچەی بایەزیدی. تاسنووری نیشتمانی ئاگری داپۆشیبوو. بەهار هات. بەڵام بەفرهێشتا بەتەواوی نەرەویبووەوە. ئاژەڵ و مەرو ماڵاتی بایەزیدیش لە ئەنجامی ئەوەی پێشمەرگەکانی ئاگری نەیان دەهێشت بێ ئیجازە بچنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان و. دەوڵەتیش رازی نەدەبوو خەڵك دەسەڵاتی ئاگری بەرەسمی بناسن. بۆیە بەشێکی زۆر لە مەروماڵات لەبرسانا مردن. کاتێ بەفر توایەوەو دنیا سەوز بوو ئاژەڵدارەکان داوایان لە حکومەت کرد رێگایان بدەن گفتوگۆ لەگەڵ ئاگرییەکان بکەن. تاکو رێگا بدەن ئاژەڵەکانیان بۆ لەوەڕاندن بنێرنە دەوروبەری ئاگری. بەم جۆرە ئاژەڵو مەڕو ماڵاتی بایەزید بەرەو ئاگری رادران. بەپێی رێکەوتنیش لەگەڵ جەنگاوەرەکان، دەبوایە بەرێژەی هەرچەند سەرێك. ئاژەڵ بەئیدارەی کوردستان بدرێت. ئابەم جۆرە تەنگو چەڵەمەی ئازووقە لەسەر دانیشتوانی ئاگری سووك بوو گوزەرانیان کەمێ باشتربوو سەرکردەی نیشتمانی کوردیش بە مەبەستی زیاتر نواندنی شکۆمەندیو دەسەڵات و رەت کردنەوەی یاسای تعجیل خالص بەگ و هەندێ لە چەکدارەکانیو. فرزەندە بەگ و چەکدارەکانی رەوانەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رۆم کرد. بۆ ئەوەی رێگاوبانەکان بگرن و هات و چۆ قەدەغە بکەن. هێڵی تەلەگراف و تەلەفۆن ببرن. ئاژاوە بنێنەوەو ئاسایشی ناوچەکەئاڵۆز بکەن .

دەستە سوارەکەی خالص بەگ کەحەوت سواربوون. ئابلوقەی هێزێکی چەکداری دوژمنیان داو ٣٠٠ کەسیان لێ چەك و زیندانی کردن. شیاوی باسە ئەو هێزە بە نوێترین چەکی سەردەم چەکدار کرابوون.

فرزەندە بەگ و کۆمەڵەی ئەدۆ عەزیزو چەند کۆمەڵەیەکی تری بچوك کە لە ئاگرینەوە دابەزیبوونە خوارەوە.دەستیان بەسەر رێگا نزیکەکاندا گرت. چەند چالاکیەکی پارتیزانانەیان ئەنجام داو گەرانەوە ناو هێزەکانی ئاگری. بەمەش سەریان لە دەوڵەت دەشێواند. لەراستیدا لەدوای ناردنی ئەو هێزانە بۆ خوارەوە تەنیا دە چەکدار لە ئاگری

مابووموه. بۆروو بەروو بوونەوەی تیپی سوپای بایەزید. ئەگەر هێرشیان بکردایە بۆ سەر ئاگری.

هاوین هات. وەرزی لە باری چالاکی و هێرش کردنــە سەر دوژمن. شێخ عبدالقادرو خزمەکانی روویان کردە چیای (شنەگ)، کەلە ئاگرییەوە دووره.

دەولەتیش ژن و منالەکانی لە ئەرزەرۆمەوە بۆ هێنایەوە. جەنگاوەرەکانی ئاگری چوونە قولایی ئەو ناوچــانــەی لە ژێــر دەسەلاتی تورك بوو. دەستەی فەرزەندە بەگ سنوری چالاکیــەکــانی خۆی، کەیــانده ناوچەی (حەسەن قەلە) ی نزیك ئەرزەرۆم. جارێکیش هێرشیان کردە سەر (خان) کە لە ناوەراستی حسن قەلەیە. هەروەها سەری قامیشیان گرت. لەو کاتــەدا چەنــد ئەفســەرێکی تورك بە خێــزانــەوە بەرەو سەری قامیش دەچــوون. جەنگــاوەرەکــانی دەستــەی فەرزەنــدە بەگ، هەموویان بەدیل گرتن بەلام لەبەر ئەوەی خێــزانــەکــانیــان لەگەل دابوو. هەموویان ئازاد کردن. حورمەت گرتنی زۆری ئافرەت و پاراستنی نامــوسیــان. رەوشتێکی مەزنی کوردە. ئەو کارە بە شێوەیەکی ئیجابی لە نێو ئەفسەرەکانی تورك بلاوبوومەوە.

## عەلۆ بەشۆ

دەستــەی عەلۆ بەشــۆ لە پێنــج کەس پێــك هاتبوو. سنوری جەولەکانی دەگەیشتە ئەرزەرۆم. جارێك لە نزیك بەرزاییەکانی پالان دوکــن مەفرەزەیەکی عەسکەری تورك بە دوایان دا دەگەرێن و بۆ سەیەکیان بۆ دەنێنەوە. دوای شەڕێکی کورت ئەفسەرێك و چەند سەربــازێــك دەکــوژرێن. جەنگــاوەرەکان دەست بە سەر چەکەکانیان دا دەگرن و بەرگە سەربازییەکانیان لەبەر دەکەن. عەلۆ بەشۆش بەرگی ئەفسەرەکەی پۆشی بوو. ئیتر گەرابونەوە.

لە ئەنجــامی شەری ١٩٣٠ دا دوای ئەوەی رژێمــەکــان ئاگــرییــان گرتە هەنــدێ لە جەنگــاوەرەکــان لێرەو لەوێ مابــوونــەوە. عەلۆ بەشۆش لەگەل جەنگاوەرێك لەیەکێ لە ئەشکــەوتــەکــان سەنگــەری گرتبــوو لە دوژمن عاسێ بوو بوو. دوژمن ئابلوقەی دان و ویستیــان بیان گرن. شەر دەستی پێکرد. پاش ماوەیەك هەڤالەکەی عەلۆ بەشۆ ویستی خۆی تەسلیم بکات.

عەلۆ بەشــۆ دوای ئەوەی هەڤــالەکەی خۆی چەك کرد. رێگای دا خۆی بەدەستەوە بدات. ئیتر هەر تەنیا خۆی لەناو ئەشکەوتەکەدا مایەوە سەربازەکان چەند نارنجۆکێکیان بۆ هەلدا. بەلام عەلۆ بەشــۆ نەیــدەهێشت نارنجۆکەکان بکەونە زەوی. هەر لە ئاسمان دەیگــرتنەوەو بۆ سەربازەکانی هەلدەدایەوە، جارێکیان نەیتوانی نارنجۆکەکە بگرێتەوە کەوتە سەر زەوی و لە نزیك ئەو تەقیەوە. هەموو دەم و چاوی بوو بە خوێن و دنیای لە

بەرچاو تاریك بوو. بەڵام نەیهێشت دوژمن هەستی پی بکات بە تفەنگەکەی کەوتە تەقە کردن لە دوژمن. شەو داهات هەوا گۆڕا.

بارانێکی زۆر دایکرد، سەربازەکانیش بۆ خۆ پاراستن لە بارانەکە خۆیان دایە پەنا تاو یڕو ژێـر رەوەزەکانی نزیك دەرگای ئەشکەوتەکەو هەر لەوێ راکشان. چونکە دەیانزانی تەنیا یەك کەس لە ئەشکەوتەکەدا ماوە.

عەلۆ بەشۆ بەرگە عەسکەرییەکەی لەبەر کردو کڵاوەکەی خستە سەر شانی. سەرباری ئەوەی بارانەکە زۆر بوو. شەوەکەش زۆر تاریك و ئەنگوستە چاو بوو. بۆیە عەلۆ بەشۆ بە هێمنی هاتە دیو ی دەرەوەی دەرگاکە ئەویش وەکو سەربازەکان لای راکشا ئیتر ووردە ووردە ریگـای خۆی کردەوە وبەرەو خوار کشا. کاتێك کەمێك لە دەرگاکە دوورکەوتەوە هەڵسایەوەو بە هێمنی ریگای گرتە بەر. هەر کەسێك کە دەیدیت بە راستی وای دەزانی یەکێکە لە سەربازەکان. بەم جۆرە لە دەست دوژمن رزگاری بوو و گەیشتەوە هەڤاڵەکانی خۆی.

رۆژێـك. ئەفسەرێکی تورك هەواڵ بۆ جەنگاوەرەکان نارد کە دەیەوێ چاوی پێ یان بکـەوێت. مەمـەد ئاغـای حەیـدەری یەکێك لە راکردووەکانی دەست هێزەکانی بوو. کە ئەفسەرەکە گەیشتە لایان رووی تێ کردن.

من لەگەڵ ئەو سەربازانە بووم کەلە ئەشکەوتەکە ئابلوقەی عەلۆ بەشۆیاندا ئایا کامتان عەلۆ بەشۆن؟

کاتێ پێیـان ناسـانـد هەڵسـایـەوەو ناوچـەوانی ماچ کردو پرسی: چۆنت توانی لە ئەشکـەوتەکەدا بێیتە دەرەوەو بە نێوان ئێمەدا برۆیت و خۆت دەرباز بکەیت؟ ئەویش چۆنیەتی بە سەرهاتەکەی بۆ گێرایەوە. جارێك مەمەد ئاغا گێرایەوە: رۆژێك عەلۆ بەشۆ ووتی: .خەونم دیوە ئەمرۆ دوژمن هێرشمان دەکاتە سەر. شەری لەگەڵ دەکەین. بەڵام من دەکوژرێم. ئەمە بەراستی رووی‌دا. دوژمن پەلاماری دان. شەر زۆر گەرم بوو. عەلۆ بەشۆ کوژرا

★ ★ ★

تەللو لە ئەمیرەکانی مەلازگرت بوو. لەگەڵ چافرەشی هاوەڵی و چەند کەسێکی هەسنی دەچنە ناوچەی موش. سەرباری چالاکیە سەربازیەکانیان ئەبوایە ببنە ئەلقەی پەیوەندی نێوان ئاگریو ناوچەکانی تری کوردستان. لەگەڵ ئەو شتانەشدا پرشنگی شێوەی خەباتی ئاگری لە و ناوچەیەدا دەبریسکایەوە. چونکە ئاگری مەڵبەندی شۆڕشی کوردستان و دڵە بزوێنەرەکەی بوو.

حاجـۆ ئاغای سەرکردەی خێلی هەرکی ئیدارەی ناوچەکانی مدیات و میردین و شەرناخی رۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیای دەکرد. دەستەکانی سەر بەئەو تائەرومو هەکاری دەگەیشت

ڕۆژنامەی تورکیایی (گجەبوستاسی) زنجیرە ووتارێکی لە ژێر سەر دێری (یاخی بوونی گەورەی ئاگریو. چۆنیەتی شەڕەکان) بڵاوکردەوەو. کە یاداشتی ئەفسەری سێئەستێرەی تورك زوهدی گۆیفن بوو. ئەو ئەفسەرە ساڵی ١٩٢٩ هاتە کوردستان و لە لیوای سوارەی ژاندار میریدا کاری دەکرد. هاوبەشی لە هەندێ لە شەڕەکانی کورد کرد. لەمانگی تەموزی ساڵی ١٩٢٩داالە زون گولراك چووە ترابزون. دەربارەی ئەمە دەڵێ:

کاتێ سایقەکانی ترابزون ناوی ئگدر- شارێکە دەکەوێتە ژووروی چیای ئاگری و زۆر نزیکی سنووری ئەرمەنستانی سۆڤیەت- یان گوێلێ دەبوو. یەکسەر سەریان بادەداو دەیانگوت: لە ئەرزەروم تێناپەرین. لەوێ دوورتر ناڕۆین چونکە یاخیبووەکان لەوێزۆرن. لەو ساڵەدا لە ڕۆژهەڵات هەوڵێکی زۆر دەدرا. هەوڵە سەربازییەکان بەردەوام بوون بۆ داگیر کردنی ئاگریو کوژاندنەوەی شۆڕش پاش ئەوەی چەند ڕۆژێك لە ترابزو ن مامەوە. هەولمدائۆتۆمبیلیك پەیدابکەم. سایقێکی دۆستی هاوەڵەکانم دۆزییەوە پاش هەوڵێکی زۆر قەناعەتم پێ کرد تا ئەرزەرۆم بمان بات. بەدرێژایی ڕێگا یۆڵە یۆڵ و ترمەترمی بۆو. چونکە دەترسا لە ڕێگا تووشی یاخی بووە کوردەکان بێ. لە گوموشهانە- شارێکەلە نیوەی ڕێگای ئەرزەروم- ترابزوند خەڵکەکە دەیانووت: جارێك مدیری ناحیەیەك دەیویست بچێتە سەرکارەکەی لە ناوچەی ڕۆژهەڵات. کاتێ گەیشتە چیای کوپ- نێوان بایبورت و ئەرزەروم- چوار چەکداری کوردیلێ پەیدابوون ڕێگایان پێگرت و ئوتومبیلەکەیان وەستاند. هەموو پارەو پولەکەیان لێ سەندو بەم شێوەی خوارەوە لە نێو خۆیان دابەشیان کرد: (ئەمەکرێی ڕێگات هەسو. ئەمەش کرێی ڕێگای خۆم. ئەمەش مالیاتی بارەگا. ئەمەش مالیاتی کێلگە). دوای ئەو دابەش کردنە گەڕانەوە لای مودیرەکەو پێیان گوت: ئێمە ڕێگر نین. تەنیا بەشی پێویستی خۆمان لە پارەکە هەڵگرت. باقیەکەشت بۆ دەگەڕێنینەوە. ئیتر باقی پارەکەیان بۆ گەڕاندەوەووتیان: فەرموو تۆ بە خوا دەسپێرین.

لەچیای کوپ دوو چەکدار وەکو بروسکە لەشاخ هاتنە خوارەوە. ڕێگایان لەئۆتومبیلەکەی زوهدی گویفن گرت. زوهدی گویفن دەنووسێ: چەکدارەکان پێیان ووتم: ( هەوا لێکمان پێگەیشتووە کەچل چەکدار لە ،دەرسیم - ناوچەیەکە دەکەوێتە نێوان ئەرزنجان و خەربونێ. ئێستا تورك ناویان ناوە توبخەلی بو ئەم ناوچەیە هاتوون. بەڵام تا ئێستا نازانین لەکوێن). ئەو ئەفسەرە بەهەزار ناری عەلی وترس و لەرزێکی زۆرەوە گەیشتە ئەرزەرۆم. سایقەکەش کەبڕیار بوو تائگدر بیبات. کاتی سایقەکە گوێی لێبوو کەچەکدارە کوردەکان ڕێگایان پێ گرتوون و لە ئەنجامی ئەوە ترس ولەرزێکی زۆریان لێ نیشتووە. هات و پێی ووتن: ناتوانم لەئەرزەرۆم زیاتر بڕۆم من دەگەڕێمەوە ترابزون ئێوەش کاری خۆتان تەدبیر بکەن.

ئەمەی سەرەوە نارەحەتی وبێزاری ئەو ئەفسەرە تورکە بوولە بەرامبەر چالاکی

ورەفتارە شۆرشگێرییەکانی کۆمەڵە فیدائیەکانی کورد. لەکاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرشانیان دا کەلەرۆژنامەیەکی ئەستەمبول چاپی کردبوو.

ئەو جەنگاوەرانەی بە ئیش وکار دەرۆیشتن بۆ ناوچەکانی دوور لەئاگری لەلایەن خەڵکەوە پشوازییەکی گەرمیان لێ دەکرا ومیوانداری دەکران. بۆیە پێویستیان بەوە نەبوو خواردن وکەل وپەل لەگەل خۆیان هەڵبگرن.
بریندارەکانیان تیمار دەکراو رەوانەی مەڵبەند دەکرانەوە جارێک دەستەیەك لەجەنگاوەرەکان چوونە ناوچەی ئادلجەوازو چیای سیپان، لەوێ هەندێ بازرگانی مەڕو مالات هەبوو. ئەو ئاژەڵدارانە میوانداری جەنگاوەرەکانیان نەکرد. تەنانەت حەیوانیکیشیان بۆ سەر نەبریبوون. ئەو بازرگانانە لە کوردستان مەرو ماڵاتیان دەکڕی و دەیانبرد لەسوریا دەیانفرۆشت بەنیازی ترساندن وهوشیارکردنەوەی ئەو بازرگانانە دەستەکانی فرزندە بەگ وخالص بەگ وئادو عەزیزی بەمەبەستی تالان کردن وهێنانی ئاژەڵەکانیان کە زیاتر لەسی هەزار سەربوو چوونە چیای سیپان. لە کاتی هێنانی ئاژەڵەکان هێزەکانی تورك ویستیان رێگایان پێ بگرن و لێیان بسێنەوە بەڵام نەیانتوانی، ئاژەڵدارەکان بروسکەیان بۆ ئەنقەرەکردو ووتیان:
ئەگەر دەوڵەت ناتوانێ خۆمان وماڵمان لەدەست یاخی بووە کوردەکان بپارێزێ. ئەوە باشتر وایە کوردستان بەکورد بسپێرێ تا تەکلیفی ئێمەش رۆشن بێت.
رووداوەکان بەپەلە دەگۆران. دەوڵەت مەبەستی خۆی لەیاسای تعجیل رەنێو نەهێنابوو. بۆیە هەیئەتێکیان بەمەبەستی گفتوگۆ رەوانەی بایەزید کرد.

# دیداری کوردو تورك

دوای لەپاوانەکانی (زۆزان) بووین فەرماندەی‌ژاندارمی بایەزید عارف حکمت ئەوەی هەواڵی بۆ ناردین هات بۆ دیدەنیمان. لەگەڵ خۆی وێنەیەکی پاشار خانمی خێزانمی هێنابوو کەلەبایەزید وەدەریان نابوو. بەمنی داو گووتی وەفدێك لە ئەنقەرەوە هاتووەو دەیەوێ چاوی پێتان بکەوێ. ئێمەش رەزامەندی خۆمان پیشان داو. کاتێ یەکتر دیتنەکەمان کردە سەعات ٨ی بەیانی رۆژی پاشتر.
سەر لەبەیانی رۆژی دواتر لەجێگایەك لەخاکی ژێر دەسەلاتی تورکیا، لەپشت سنووری ئاگری تورکیا یەکترمان بینی وەفدی ئێمە لەمن (ئیحسان نوری ) وچەند سەرکردەیەکی کورد. لەگەڵ ٢٠ سوار لەهەرە ئازاو گیانفداکارەکان پێکهاتبوو ئەو سوارانە ژیان و تاقی‌کردنەوەی تەمەن قاڵ کردبوونەوە.

بەلام تورکەکان بە دوو ئوتومبیل هاتن. دە سەربازیان لەگەلدا بوو. وەفدی تورك پیکهاتبوو لە دوو نوینەری ئەنجومەنی بالای نیشتمانی تورك کە یەکێکیان نوێنەری ئەستەمبول و ئەویتریان نوێنەری بایەزید سەرکردەی تیپی قەرەکو سەبوو. لەگەل هەندێ ئەفسەرو عارف حکمت و فەرماندەکانی ژاندارمی بایەزید. پێشنیارەکانی نوێنەرانی هەیئەتەکە بریتی بوو لە:-

١- گەرانەوەی ئەمن و ئاسایش بۆ ئاکری.

٢- واز هینان لە ریکاوبان برین و. چالاکی و خراپەکاری دژی دەولەت.

٣- دانەوەی مەرو مالات و ئاژەلی بازرگانەکان.

٤- ئیحسان نوری. بە پێی هەر داواکاری یەك کە خۆی دەست نیشانی بکات. ئاگری جێ بهێلێ.

لەبەرامبەر جێبەجێ کردنی ئەو چوار خالەی سەرەوەش دا. دەولەت لێ بوردنێکی گشتی بۆ هەموو خراپکاری یەکانی ئاراراتیەکان دەردەکات. هەموو پێویستی یەکی ئاسودەییان بۆدابین بکات. من بە دەوری خۆم هەموو پیشنیارەکانم رەت کردنەوە. پێیان ووتم:بگەریێرەوە نیشتمانی خۆت، دەولەت هەموو پێداویستی و ئاسودەییەکت بۆ دابین دەکات. وەلام دانەوە: من لە نیشتمانی خۆمم. هیچ پێویستیەکم بە ئێوە نیە. لە راستیشدا هیچ براوایيەکم بە قسەکانی دەولەتەکەی ئێوە نیە: ووتیان هەر دەولەتێك هەلدەبژێری رووی بکەیتێ. ئێمە لەوێ کارەکانت بۆ ئەنجام دەدەین و پارەمەتیشت بۆ دەبرینەوە. ووتم: نامەوێ ناوی دەولەتی ئێوە بەسەر منەوە بێت. ووتیان: پەساپۆرتت دەدەینێ. برۆ هەر شوێنێك خۆت ئارەزوو دەکەیت. قونسولی تورك لە تەبریز بەدەستی خۆی پەساپۆرتەکەت دەداتێ. وەلامم دانەوە.

بێ هودە خۆتان ماندوو مەکەن. ناچمە هیچ شوێنێك. من خزمەتکاری گەلی کوردم. تەنیا ئەوان (واتە کورد) دەتوانن دەستوورم بۆ دەرکەن. ئەگەر ئێوە راست دەکەن وەلامی ئالای سەربەخۆیی کوردستان بدەنەوە کەبە بەرچاوی ئێمەوە لەسەر دوندەکانی ئاگری دەشەکێنەوە.

باسی مەرو مالاتی بازرگانەکانیان کردو ووتیان: کێ ئەو مەرو مالاتەی هێناوە بە خاوەنەکانیان بدەنەوە.. پێم ووتن: ئەوانەی مەرو مالاتەکانیان هێنا. هەموویان خوارد تەواو بوو. ئەگەر بروا ش ناکەن. پەنجەم بۆ فرزەندە بەگ و خالص بەگ درێژ کردو گوتم: ئەمانە مەرو مالاتەکانیان هێنا. فەرموون لێ یان بپرسن. یەکێ لە نوێنەرەکان بە فرزەندە بەگی ووت: ئەگەر مەرو مالاتەکان نەگەرێننەوە. دەولەت لێتان نابورێت. فرزەندە بەگ وەلامی دایەوە: ئێمە پێویستیمان بەوە نیە داوای لێ بوردن لە دەولەت بکەین. ماوەیەکیش قسەیان لەگەل بروهەسکی کرد. ئێمەش بە دەوری خۆمان قسەمان لەگەل ئەفسەرەکان کرد.

داواکاری یەکانی ئاگری تەنیا خۆی لە دوو ووشە دەنواند:ـ (سەربەخۆیی کوردستان). دڵنیاش بووین لەوەی کەدەوڵەت باش ئەو راستی‌یە دەزانێ. شەکانەوەی ئاڵای سێ رەنگی سەربەخۆیی کوردستان لەسەر دۆندەکانی ئاگری. چیای جزیرەو بۆتان. مدیات. ساسون. خەرزان و چیاکانی تری کوردستان. باشترین بەڵگەی ئاشکرای ئامانجەکانی کوردبوون. دیاریش بوو دەوڵەت دەیوست بمان خەڵەتێنێ.

ئەوەی لەو گفتوگۆیەدا لەسەری رێکەوتین ئەوە بوو کە ئاگری‌یەکان پەلاماری بایەزید نەدەن. دەوڵەتیش هێزو سەرباز رەوانەی سەر کوردەکانی ئاگری نەکەن.

لەدوای تەواو بوونی گفتوگۆکانماندا هەندێ لەو ئەفسەرانەی. کەلە ئەستەنبول ناوی ئیحسان نوری‌یان بیستبوو. بە ئیحسان نوری‌یان ووت

چ خزمەتێکی تایبەتی و شەخسیت هەیە بۆت ئەنجام بدەین؟ ووتم: ژنەکەم رەوانەی حەلەب بکەن!

هاوین هات و رۆیشت. خێلەکان پاوانەکانیان جێ هێشت و گەڕانەوە گوندەکانیان شێخ عبدالقادریش دوای خۆ تەسلیم کردنەوە بە دەوڵەت. هەر بە موالی دەوڵەت مایەوە و لە گوندێکی ناوەراستی رۆژ ئاوای ئاگری نیشتەجێ بوو. بەلام عەلۆ بەشۆ گوێی لە شێخ نەگرت و تەسلیمی دەوڵەت نەبوو.

شێخیش چەکدارەکانی خۆی نارده سەری. ئێمەش بە دەوری خۆمان بە دەنگ عەلۆ بەشۆوە چووین. ئیتر چەکدارەکانی شێخ گەرانە وە ئەو شوێنەی لێی هاتبوون.

هەندێ لە خانەوارەکانی خێلێ هەسە سوری داوایان لە دەوڵەت کرد. رێگایان بداتێ گوندی کانی کورکی روخێنراو دروست بکەنەوەو لێی نیشتەجێ ببنەوە. گوندی کانی کورك کوتبووە ناوەراستی ئاگری و رووبەرووی سنووری ئاگری ـ تورکیاو لە ژێر دەسەلاتی تورکیا بوو. کانی کورك مەڵبەندێکی باش بوو بۆ گفتوگۆی نێوان دەوڵەت و ئاگری‌یەکان. چەند رۆژێك دوای ئاوەدان کردنەوەی گوندەکە چاوپێکەوتنی دۆستانە لە نێوان ئەفسەرەکانی شاری بایەزید لەم گوندەدا ئەنجام درا. حەمید ئیسماعیلی کوێخای گوندەکە میواندارێ‌یەکی باشی کردین.

دانیشتنەکانمان باری دۆستانەی بە سەردا زاڵ بوو. چەند وێنەیەکیشمان بۆ یادگاری گرت.

ئەفسەرە تورکەکان پێشنیاریان کرد رۆژێك ئیحسان نوری بە میوانی بچێتە بایەزید بۆ سەردانیان وەلامم دانەوە: ئەگەر زامنی سەلامەتی‌و گەرانەوەم بکەن بە سەرچاوو خۆشحاڵیەوە دێم، لە پیاوەتی و کەرامەتی ئەفسەرە تورکە هاوەڵەکانم دڵنیا بوم کە فێل و خیانەتم لەگەڵ ناکەن ئەفسەرەکان ووتیان: بیری لێ دەکەینەوەو دوایی دەنێرین بە دواتا بەلام دوایی هیچ هەواڵ و باس نەبوو، پاش چەند رۆژێکی کەم لە رێگای والی بایەزید، لە

وەزارەتی ناو خۆی تورکیاوە ئاگاداریان کردم کە هاوسەری ژیانم تورکیای بەجێ هێشت و بەرەو سوریا رۆیشت.

لەسەر پێشنیاری حکومەت لێ پرسراوەکانی بایەزید جارێکی تریش لە گوندی کانی کورك لەگەڵ سەرۆکەکانی ئاگری دانیشتنەوە. لە دانیشتنی ئەم جارەدا، هەندێ لەسەرۆك خێلە کوردە●والی یەکانی حکومەت لەگەڵ نوێنەرەکانی تورك هاتبوون. لەوانە تایموری کەسکویی. سەرۆك خێلی کەسکویی بوو. لە نێو قسەکانی دا ووتی: من تورکی کوڕی تورکم. بەو قسانەی مەرایی و ماستاوی بۆ حکومەتی تورك دەکرد، تەئسیری ئەو قسەیە لەسەر ئاگری یەکان گەلێ زۆر بوو. بروهەسکی زۆر بەساردی و قێزو تووڕەبوونەوە. وەلامی دایەوە. لەخوام داوایە لە دوای مردنت لەگەڵ برا تورکەکانت بتنێژن.

هەر لە زستانی ئەو ساڵەدا، لە شەرێکی نێوان کوردو سەربازەکانی تورکدا لاشەی تەیمور لە پاڵ لاشەی ئەفسەرێکی تورك. لە چاڵایەکدا دۆزرایەوە. هەردوو لاشەکەیان لەناو یەك گۆڕدا ناشت. بەمەش دوعاکەی برۆ هاتە دی.

چەند رۆژێك دوای ئەو یەکتر دیتنە. رووداوێك رووی دا. ئەو رووداوە بۆ سەرۆکی ئاگری یەکانی روون کردەوە. کەمەبەست لەو دانیشتن و گفتوگۆیانە. تەنیا خەڵەتاندن و خلیسکاندنی ئاگری یەکان بوو.

## شەڕی کانی کورك

سەر لە بەیانی رۆژێکی پایز، شنەی شەماڵ یاری بەگەڵای دارەکان دەکرد، خوناو زەوی رشاندبوو. دڵۆپی رۆندکی سەر گەڵا زەردە جوانەکانی پاوانەکان وەکو دڵۆپی زیوی سەر کوڵەزەردەکان بوو. تیشکی هەتاو پەردەی تاریکی شەوی دڕاندبوو و بڵاوەی پێ کردبوو بۆ سەرەوەی هەورەکان. لەگەڵ کەوتنە سەر زەوی تیشکی هەتاو تەقە لە نزیك هێڵی سنووری کورد ـ تورك دەستی پێ کرد. هەروەها گوێم لە دەنگی تۆپ بوو. هێندەی نەبرد گوندی کورد ئاڤابوو بە نیشانەی تۆپەکانی دوژمن.

گوندی کورد ئاڤا چەند سەد مەترێك لە سنووری کورد ـ تورکیا دوور بوو. ئاڵای کوردستانیش لەسەر بانی ئەو گوندە دەشەکایەوە ئەو گوندە پێشتر ناوی تورکمەن بوو. گۆڕێم بە کورد ئاڤا.

تورکەکان ئەو بەڵێنانەی پێ یان دابوو ین شکاندیان، ئێمەی کوردیان غافلگیر کرد. ئەبێ ئەو راستیە بڵێن کە کوردەکانی ئاگری یان خەڵەتاند.

بەشێك لە هێزەکانی ئاگری خەریکی کاری دابین کردنی ژیانی خۆیان بوون. لەو زەوی یانەی کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی تورکیا. هەندێ لە سوارەی کورد هەر لە سەرەتادا

روویان کرده هەندێ ناوچەی بەرزو ستراتیجی لە نێوان ئاگری گەورەو ئاگری بچووك. بۆ ئەوەی نەهێڵن هێـزەکـانی دوژمن دزەی بۆ بکەن و بیگرن. ئەو لوتکە بەرزانە هەمیشە شوێن مەبەستی هێرشەکانی دوژمن بوو.

بۆ ئابلوقەدانی هێزەکانی ئاگری و. پچراندنی پێوەندییان لەگەڵ خاکی ئیرانی بێلایەن دا. هەمـوومـان لەنـاو گونـدی بووین بۆیـە کەسێـك بەسەر لوتکەکانەوە نەبوو تاکو لەهـێرشەکان بمانپارێزن ئەگەر چی گوندێکی هاوسێشمان بە ناوی موسی بێرکی هەبوو. بەڵام هەنـدێـك لێمـان دوور بوو. بۆیـە سوارەکـان چوون و لووتکـەکانیان زامن کرد. دانیشتوانی هەردوو گوندەکەماڵەکانیان چۆڵ کرد. ژن و مناڵەکانیان رووەو سنوری ئێران رەوانەکرد. فرۆکەکانی دوژمنیش لە ئاسمانی ئاگریدا ئاگروئاسنی ساروخەکانیان بەسەر ژن ومناڵەکاندا دەباراند.

سەرکردەی کورد لەگەڵ بروهەسکی و ١٢ کەس لەگوند مانەوە بۆ لەروو وەستانەوەی هێرشـەکـانی دوژمن. شەر دامـەزراو گەرم بوو. بەڵام بە نیسبـەت ئاگرییەکان شتێکی ئەوتـۆنـەبـوو. چاومان لێبوو هێرشەکانی دوژمن سەنگەرەکانی بەرامبەر کانی کورکیان داگیرکرد. چەند سوارو تۆپێك لەوێ بوون. چاومان لە هیچ هێرشێکی هێزی پیادە نەبوو. تەقەی تفەنگ و تۆپەکان روویان لە ئاگری نەبوو. بەڵام شەوێکی قورس لە دەوروبەری کانی کورك هەبوو.

ژمـارەی دانیشتـوانی کانی کورك ٢٥ خانـەوادە بـوو. دوای رەزامـەنـدی حکومەت گونـدەکەیان ئاوەدان کردبووە. تێکۆشەرەکانی ئاگریش لەوە دڵنیابوون کە دانیشتوانی گوندەکە کارێکی وایان نەکردووە. دوژمن بوو روژێنن. تاکو هێزەکانی دوژمن بەم جۆرە لە هەمـوو لایـەکەوە پەلاماریان بدات. لە پڕ دووکەڵ لەکانی کورك بڵند بوو گوندەکەی لە ئامێزی خۆی گرت. بۆیە ژن و مناڵەکان رووەو سنوورو ئاگری رایان کرد. من بە سواری ئەسپـەکـەم بۆ بەسـەر کردنەوەی ناوچەکە دەچووم چاوم لێی بوو بەرەوگوندی شێخ عبدالقادر دەچوون. گەموالی حکومەت بوو. لەکاتی راکردنیان دا چاوم لێ بوو دوو مناڵ دایکیان وون کرد بوو. لەو دەشتە بەتەنیا مابوونەوە و دەگریان. منیش سکی دووکەلی تۆپەکانی دوژمنم بڕیو هەردوو مناڵەکەم خستە پشتی ئەسپەکەو گەیاندمنە لای هەڤاڵان.

فرۆکەکانی دوژمن لە بوردومان کردنی ژن و مناڵ بەردەوام بوون. لە پڕ برازایەکی برو کە تەمەنی ٩ساڵ بوو. بە تفەنگەکەی فرۆکەیەکی پێکاو. کەوتە سەرزەمینی ژێر دەسەڵاتی تورك. دەستەیەکی سوارەی تورك بەمەبەستی دەربازکردنی فرۆکەوانەکە یەکسەر بەرەو فرۆکەکە رایان کرد. کەوتنە پشتی تەپۆلکەکان و لە ئێمە وون بوون.

تا ئەو کاتەش کەس نەیدەزانی هۆی ئەو هێرش و. رژاندنی جامی رق و تورەیی تورك چیـە بەسەر ئەو گوندەدا. هێندەی نەبرد چەند جەنگاوەرێك کە لەدیوی سنوری تورك بوون گەرانەوە. ئەوانیش ئەمانە بوون: ئیلخان. کورە بچوکی بـرو- مەلا شونوالله. لە

وەفادارەکانی گەلی کورد. کە لەرۆژانی هەینی. لە سەر مینبەری مزگەوتی ئاگری بەناوی گەلی کورد ووتاری دەخوێندەوە. پێنج پێشمەرگەشیان لەگەڵدا بوو و هاتنەوەو گوتیان: دوێنێ شەودرەنگانێك گەیشتینە کانی کورك.

گەلێ هیلاك و ماندو بوین. ویستمان شەو لە ماڵی حەمید ئیسماعیل بمێنینەوە و بەیانی بێینەوە. نازانین تورکەکان چۆنیان زانی بوو کە ئێمە لەو ماڵەین. بەیانی زوو خاوەن گوندو خانە خوێمان (حەمید ئیسماعیل) بۆ دەست نوێژ چووبووە.دەرەوە۔ چاوی بەژمارەیەك سوارەی تورك کەوتبـوو. کە بەرەو گونـدەکـە دەهاتن. ئەویش یەکسەر جەنگاوەرەکانی وەبیرهاتبووەوە کە میوانی ئەون. رەوشتی کوردیش وایە هەموو شتێك دەکاتە قوربانی پاراستن و سەلامـەتی میـوانەکانی. بۆیەش حەمید بانگی لە سوارە تورکەکان کردبوو. نەیـەنـە پێشـەوە. لەلایەکی تریشەوە بانگی لەژنەکەی کردبوو تفەنگەکەی بگەیەنێتێ. ژنـەکـەشی تفـەنگـەکەی گەیاندبووێ. ئێمەش لەو کەین و بەینەدا هوشیار بووینەوە. تفەنگەکانی خۆمان دەست داێ وسەنگەرمان گرت.

سوارەکان نەوەستان بەردەوام بوون لەهاتنە . پێشەوە بەرەو گوند. حەمید ئیسماعیل تەقەیەکی کردو یەکێکی پێکا ئێمەش فریای کەوتین. لەپاڵ حەمید دەستمان کرد بەتەقە. دانیشتـوانی گونـدەکـەش بەهانامانەوە هاتن. ژمارەیەکمان لەسەر بازەکان کوشت و دەستمـان بەسـەر چەکـەکـانیـان داگرت. دوای ئەوە تیپێکی سەربازی دوژمن. کەشەو لەدەوروبـەری گونـدەکە مۆلیان خواردبوو. بەهاواری سەربازەکانەوە هاتن. ئیتر شەڕ بەگەرمی لەنێوانمان تاوی سەند. سێ کەس لەدانیشتوانی گوندەکە شەهید بوون. کاتێ زانیمـان دەرەقـەتی تیپـە سەربـازی یەکـەی دوژمن نایەین. گوندەکەمان چۆڵ کرد. کشانەوەماندا ٣ ئافرەت و منالێکی چوار سالە شەهید بوون. ئێمە (جەنگاوەرەکانی کەلە گوندەکە بووین) بەرەو لای ئێوە هاتین و خەڵکی گوندەکەش بەرەو لای شێخ عبدالقادر رۆیشتن. دواتر زانیمان کە دوو پیاوو کچۆڵەیەك و ـ خێزانی حەمیدو براکەی لە پاداشتی میوانداری چەند رۆژی پێشتری ئەفسەرە تورکەکان. بە گوللەتۆپی دوژمن بریندار بوو بوون.

هێزەکانی تورك دوای دانیشتوانی گوندی کانی کودك کەوتن کەڕایان دەکرد. هێزەکانی دوژمن هەر بەوەش نەوەستان بەڵکو سنوریان بەزاندو هاتنە ناو خاکی ئێمە. دەیانویست دەست بەسەر مەرو ماڵاتی دانیشتوانی کانی کورك دا بگرن کەلە لێواری رووبار. بەدیوی لای ئێمە دەیان لەوەراند. راکردنی ژن و منالەکان و راوە دوو نانیان لەلایەن هێزەکانی دوژمن رووداوێکی تراجیدی دەهێنایە بەر چاو. ئەو کارەساتە هیچ دەرفەتێکی زیاتر چاوەروان کردنی بۆ جەنگـاوەرەکـان نەهێشتـەوە. کە تا ئەوسـاتـە لەسـەر دوندەکانەوە سەیری رووداوەکەیان دەکرد. ئیتر جامی سەبر لەسەری رژا وجەنگاوەرەکانی ئاگری بۆ پاراستنی گیانی ئەو هەموو خەڵکە خۆیان خستە ناو ئاگری شەرەکەوە.

کوردە ئازاکـان لەسـەر ئەوە یەکـانگیربوون. کە داستانی قارەمانێتی باوو باپیرانیان زیندوو بکەنەوە. کەمێژوو شانازیان پێوە دەکات. ئەبێ کارێکی وا بکەن گیانی ئەو پیاوە گەورانـە شاد بکـەنا . کە بە شمشێرو بەسواری ئەسپەکانیان دڕیان لەشەوی زوڵمەتی دوژمنان داو ئازادی نیشتمانەکەیان پاراست. ئەبێ بۆ هەموو لا یەکی بسەلمێنین. ڕۆ لە کوردەکانی ئێستا وەچەی ئەو قارەمانە مەزنانەن. گیانفیداکاری مەیدانی جەنگن و، هیچ گۆڕانێك بەسەر گیانی جەنگاوەری و خوێنی پاکی ئاری یاندا نەهاتووە.

بەکورتی ویستیان لەو ڕۆژەدا. گیانی ئازایەتی و فیداکاری نێوان کوردو تورك بەراورد بکەن. دۆست و دوژمنان نا چار بکەن دان بە ئازایەتیان دابنێن.

ئامادەی گیانبازی بوون لە پێناوی پاراستنی ئازادی خۆشەویستەکەیان. ئەگەر چی ژمارەو جۆری چەکی دوژمن گەلێ لەهی ئاگری‌یەکان زیاترو چاکتر بوو.

هەر کوردیـك ڕووبـەڕووی سەد سەربازی دوژمن دەبوومەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاگری‌یەکان هەر سوور بوون لەسەر بڕیاری خۆیان. بۆ ئەنجام دانی ئەو کارەش ئەبوایە ئازایەتی و گیانفیدا کاری کوردەکان جێگای کەمی ژمارەو جۆری چەکەکانیان پڕ بکاتەوە.

دوای لستنـەوەو ماچ کردنی بەردە ڕەشەکانی ئاگری. کەبەنیسبـەت گەلی کورد وەکو بەردی ڕەشی کەعبە وایە.

پشتیان کردە ئاگری و سنگیان کردە دوژمن. بێ گوێ دانە هێزو چەکی دوژمن بەرەو پێش هەنگـاویـان نا. مەیـدانی شەڕ بێ پێـچ و پەنا بوو. لە ئاگری دووربوو. ئەمەش بەهـانـەی دوژمنی سڕی‌یـەو لەوەی کە هەمیشـە دەڵێن: کوردەکان پسپۆڕن لە سوود وەرگـرتن لە بەرزایی و زورگ و شاخ و دۆڵەکـان لەشـەڕدا. ژمـارەی هێـزەکانی دوژمن زۆرتـر.جۆری چەکیان باشتر. بەشی زۆری گردو تەپۆڵکە بەرزەکان بەدەست دوژمنەوە بوو. هێـزەکانی دوژمن لەناو گوندو لەسەر تەپۆلکەکان بوون. بە پێچەوانەی ئەوانەوە کوردەکـان لە زەوی‌یـەکـی تەخـت و بێ پەنـاو پێـچ بوون. لەگـەڵ ئەو هەمـوو جیـاوازیـە.کوردەکان سوور بوون لەسەر شەڕ با ئەنجامەکەی هەرچی‌یەك بێت. گیانی ئازایەتی کوردە ئێرانیە دێرینەکان بە جۆرێکی ئەوتۆ هانی دەدا. کەپێشبرکێ‌یان لە سەر گیانبازی دەکرد.

ئاگری‌یەکان نەیان دەویست خوێنی کوردە بێ‌گوناحەکان بڕژێت. بەڵکو دەیان ویست تۆڵەیـان بسێننـەوە. دەیـان ویست گوڵە سپی‌یـە پاییزی‌یـەکـانی لێـواری ڕووبـارە سنـووریـەکـەوسـەوزایی زەویەکە بەخوێنی خۆیان ڕەنگ بکەن و بگەشێننەوە. دەیان ویست جارێکی تریش شەکـانـەوەی ئاڵای نیشتمانی کورد وەبیربێننەوەو.بێننەوە بەر چاوان. ڕیزی گوللە و تۆپ و ساروخەکانی دوژمن ڕێگای بەرەو پێشەوە چوونی لێ نەگرتن. جەنگاوەرە کوردەکان خوێن لە دەمارەکانی لەشیاندا دەکوڵا. هێزەکانی دوژمن نەیانتوانی خۆیان لە بەردەم خۆراگری و دلێری هێزەکانی ئاگری بگرن. بۆیە لە ئاگری‌کشانەوە بەرەو

گوندی کانی کورك رایان کرد. دوژمن بە خەستی تۆپ بارانی پردی سەر رووبارەکەی بەردەم گونـدەکەی دەکرد تاکوردەکان نەتوانن لێیەوە بپەڕنەوە. هەڤاڵە جەنگاوەرەکانم گەیشتنە سەر پردەکەو سەنگەریان گرت و دەستیان بەشەڕکردن کرد

هەڤاڵەکانم هەموویان پیادە هەر تەنیا من سوار بووم. کاتێ گەیشتمە نزیك پردەکە کە جێگایەکی وام بەدی نەکرد ئەسپەکەی لێ بشارمەوە. بۆیە لەنزماییەك بەستامەوە. دوژمن بەخەستی بە مەترلوز پردەکەی گوللە باران دەکرد بۆ ئەوەی نەهێڵێ کەسێك بپەڕێتەوە. سەیرم کردو شەڕەکە بەم جۆرە درێژە دەکێشێت. تەوەکەلم بە خواکردو سواری ئەسپەکە بوومەوەو گەیشتمە پردەکە. هەرچەندە هەڤاڵەکانم داوایان کرد پیادەبم نەوەکا ببمە جێ نیشانی گوللەی دوژمن کەلە گوندەکە مۆلیان خواردبوو. من پەڕیمەوەو رووی چەکەکەم کردە گونـدەکـە. لەوێش تەقـەیـان روو بەرووم کرد بەڵام من نەگەڕامەوەو چوومە ناو گوندەکە. تورکەکان لەلای ترەوە لەگوندەکە چوونە دەرەوە. هەر لەو کاتەدا فەرمان بەیادو

دڵخەری‌و عوسمان کیلەم وسی سواری‌تر کرا ناوچەی روو بە رووی پردەکە ببرن کە ٥٥٠ مەترێك دەکەوێتە رۆژ ئاوای پردی کانی کورك. ئەوانیش ئەسپەکانی خۆیان بەرەو تەپۆلکەکانی دەستە راست تاودا کە هەندێك دەکەوتە پشتی هێزەکانی دوژمن.

چەند ئافرەتێك لە گوندەکە دیل کرا بوون. یەکێ لەوانە سك پڕ بوو. هەموو خۆیان شاردبووە. تورکەکان گوندەکەیان چۆڵ کردبوو. ئافرەتێك کە رازی نەبوو لەگەڵیاندا بچێت کوشتبـویـان. شوێنی چەند نوکە رمێك بەلاشەیەوە دیار بوو. ئەو ئافرەتە ژنی ئامۆزای حەمید ئیسماعیل بوو. هەندێ لە ئافرەتەکان کەچاویان پڕ لە فرمێسك بوو.

وەختێ زانیـان کوردم خۆیان گەیاندە لام وخۆیان بەئەسپەکەمەوە شۆڕ کردەوە. قاچی ئەسپەکەیان گرتبوو نەیان دەهێشت زیاتر بەرەو پێشەوە بڕۆم.

برۆ و هەڤاڵەکانی رووبەرووی پڕ دەکە سەنگەریان گرتبوو. تەقەیان لەدوژمن دەکرد. کاتێ بینی‌یان من بەسواری ئەسپەکەم گەیشتمە ناو گوندەکە هەڵسان وپیادە لەپردەکە پەڕینەوەو بەرەو لای من هاتن. ئافرەتەکانمان وەلا ناو هەموومان چوینە پشتی گوندەکە. لەو کاتە یادو دڵخەری وعوسمان کیلەم گەیشتنە سەر تەپۆلکەکانی پشتی دوژمن وکەوتنە دەست وەشاندن لێیان. کاتێ تورکەکان سەیریان کرد. ئێمە دەستمان بەسەر گوندەکەدا گرت و. لەدوو لاشەوە هێرشیان دەکەینە سەر. ترسێکی زۆریان لێنیشت و. یەکجاری وورەیان بەردا.

برۆ هەسکی ووتی: ها ئێستـا نۆرەی من هات. دوای تکـاو لێـسـوور بونێکی زۆر ئەسپەکەی لێ سەندم، ئیتر بەسواری کەوتە شوێن ئەو سەربازانەی لەکانی کورکەوە رایان کردبوو بەڵام زۆر دوورکەوتبوونەوە بۆیە هەرواو بەبێ دەسکەوت گەرایەوە برۆ دڵی ئاوی نەخواردبووە بۆیە دیسان هەر بە تەنیا رووی کردە سەنگەرەکانی لایەکی تری دوژمن

ڕێگاکە دووروو زەوی یەکە تەختانی و بەردەلان بوو. ئێمەش بۆ ئەوەی تورکەکان دەرفەتی لێنەهێنن. بەخستی گوللەبارانی دوژمنان کرد. برو گەیشتە ئەو تەپۆلکەیەی تورکەکانی بەسەرەوە بوو. بەڵام تورکەکان بەهۆی پاشەکشەو شلەژاوی خۆیان هیچ ئاگایان لە برۆ نەبوو. فەرماندەی رۆمەکان لەهەموویان زیاتر بەپەلە بوو بۆ کشانەوە سواری ئۆتومبیلەکەی بوو ورای کرد. پاشان ئۆتۆمبیلەکەی بۆ راکێشانی تۆپە قورسەکان ناردەوە ولەدەست کوردەکانیان دەرباز کرد.

یادو زیلانی دلخەری کەلەپشتەوەی دوژمن سەنگەری گرتبوو کەوتە هێرش کردنە سەر پاشماوە شکاوەکەی هێزی دوژمن. توانی هەندێکیان بەدیل بگرێت. ئێمەش لەگوندی قوتس بەرامبەر شاخەکەی پشتی بایەزید بووین. هاتینە دەرەوەو دەستمان بەتەقەی هەوایی کرد بەسەر پاشماوەی ئەو هێزە شکاو وراکردووە. هەروەها کۆمەڵێك سەرباز لەگەڵ تۆپەکانیان لەسەر بەرزایی قوتس بوون. ئەو شەرە شتێکی سەیر بوو.

زیاتر لە ۲۰۰۰ هەزار پیادە سواری مەشق پێکراوی چەکدار. بەباشترین تۆپی گەورەو بچوك وقازیفەی قەنابیل ونارنجوك. رووبەرووی ۱۵ پیادەو ٦ سواری کورد دەبوونەوە بەڵام وەکو ئەوە وابوو گورگ بکەوێتە ناو مێگەلێکەوە. هەر کەسە بۆ خۆی رای دەکرد. کەس هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو.

ژمارەیەك بەدیل گیران. فرۆکە پێکراوەکەو یاساولەکانی بەتەنیا مابوونەوە. کوردەکان تاگوندی قوتس ی قەدپاڵی چیاکەی بەرامبەری بایەزید چوونە پێشەوە.

کوردیکی خەلکی گوندی هەلاج بەناوی ابراهیم ئازوکە کە فرۆکەوانی فرۆکە پێکراوەکەی گەیاندبووە شاری بایەزید. لەکاتی گەرانەوەیدا بەهەورازەکانی قوتس دا هاتەوە کەپێیان دەووت (شەیتان هەوراز) کاتێ گەیشتە لای ئێمە ووتی کاتێ گەیشتمە شەیتان هەوراز چاوم لێبوو سەربازە تورکەکان لەبەردەم ئێوە رایان دەکرد. هەندێ ئەفسەریش لەدوورەوە بە دووربین سەیریان دەکرد. یەکێکیان لەئەژنۆی خۆی دەداو دەیووت : خودایە ئەونەکبەتیە چی‌یە؟ ئەو هەموو پیادەو سوارەیە کەتۆپ پشتیوانیان لێ دەکات. ناتوانن خۆیان لەبەردەم چەند کوردێکی سك دراوی برسی بگرن و رادەکەن؟

ئێمە نەمانزانی ئەو راپۆرتەی فەرماندە تورکەکە دەربارەی ئەو شەرە نوسی. هێزەکانی کوردی بە چەند تەقدیر کردبوو. دەنگی شەرەکە لە نێو خەلك بلاوبووەوە ببوە ئەفسانە. چەندین داستانی دەربارەی هۆنرایەوە. دەیان ووت سوار ئەسپێکی سپی لەریزی کوردەکاندا بوو. هێرشی دەکردە سەر تورکەکان و تێکی دەشکاندن.

رۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو کە هەندێ لە جەنگاوەرەکان بەرەو فرۆکە پێکراوەکە چوون ۱۲۰ جەنگاوەر بەفەرماندەیی ئەیوب ئاغای برای برۆهەسکی . لەگەڵ ژمارەیەك لە چەکدارەکانی موسی بێرکی لەپێش هەموو کەسێك گەیشتنە سەر یاساولەکانی فرۆکەکەو دەستیان بەتەقەکرد. سەربازەکانی بەشێوەیەکی چاك خۆیان لەسەنگەرنابوو. لەنێوان

تەپۆلکەکانی نزیك گوندی دوودکان سەنگەریان لێ دابوو. دەبوو جەنگاوەرەکان ماوەی یەك کیلۆمەتر لەزەویەکی تەختاییو لە ژێر دەست ڕێژی گوللەی دوژمن بڕۆن تا دەگەنە فڕۆکەکە، سەید رەسول بەرزنجی وفەرزەندە هەسنی. کەنموونەی ئازایەتیو قارەمانێتی بوون لەلای چەپەوە کەوتنە تەقەکردن لەسوارە تورکەکان. ژمارەیەك لەجەنگاوەرەکانیش رووبەروو سەنگەریان لە دوژمن گرت.

ئەو سوارە کوردەش کە بەتەنیا چووە کانی کورك. توانی بگاتە ئەوکەندەی ناوەراستی گردۆلکەکانی نێوان کوردو تورك. شەر لەنێوانیاندا گەرم بوو. سوارەکە لەئەسپەکەی نەهاتەخوارەوە. بەڵکو خۆی بەلاداخست تاگەیشتە لای ئەو گردەی دوژمنی بەسەرەوەبوو. بەهۆی لاشە زۆرە کوژراوە کەوتووەکان توانی خۆی لە ئاگری دوژمن بپارێزی.

فەرماندەی سوارەکانی تورك زانیان دەرەقەتی کوردەکان نایەن بۆ یە بریاری کشانەوەی دا. خۆی و سی سەربازی سوارەتێیان تەقاندو رایان کرد. سەید رەسولو فەرزەندە چوون ئەو ئەفسەرە بگرن. بەلام پێرا نەگەیشتن.

سەربازەکانی تر نەیانتوانی بگەنە ئەسپەکانیان بۆیە پیادەرایان کرد کاتێ دەنگی تەقە کەم بوەوە جەنگاوەرەکان بانگیان کرد: رۆمەکان رایان کرد. منیش بەپەلە بەرەو شوێنی رومەکان چووم. ووڵا خەکانیان لەگەڵ ٣ کوژراو وچەند بریندار و چەکەکانیان لەوێ مابوەوە. کوردەکان دەستیان بەسەر ووڵا خەکانیان داگرن دوژمنیش لۆقە لۆق دەکشا نەوەو. وەکو رەوە باڵندەی شکاری لەوزەوی یە تەختانیە دا رایان دەکرد.

سوار ئەسپێکی کورد. کاتێ بینی سوارە تورکە کان خەریکە دەرباز دەبن. بەتەنیا ئەسپەکەی رووەو دوژمن تاوداو گەیشتە سەریان. تفەنگی پێ نەبوو. بەڵام دەمانچەکەی بەدەستەوە بوو . گوللەیەکی بەرەو دوژمن تەقاند. دەمانچەکەی وەستاو قەوانەکە لەلوولەی دەمانچەکەی مایەوە. سەربازە تورکەکان کاتێ ئاوریان دایەوە دیسان تەنیا سوارێك دوایان کەوتوە ناشیەوێت خۆی بشارێتەوە بەڵکو بە تورکی بانگیان لێ دەکات:خۆتان تەسلیم بکەن: دەستتان بەرزبکەنەوە! هێزەکانی دوژمن حەپەسان. وەکو بلێی باڵندە لەسەرسەریان نیشتبێتەوە. خۆیان تەسلیم کرد. سوارەکە گەیشتە ناوەراستی دوژمن و سەربازێکی چەك کردو فەرمانی پێدان: چەکەکانتان بخەنە سەر زەوی! ئەوانیش بەگوێیان کردو چەکەکانیان دانا. ئینجا دیلەکانی دڵنیا کردو پێی ووتن: ئەمشەو رەوانەی بایەزیدتان دەکەمەوە. ئەو سوارەش جیا لەسەرکردەی کورد کەسێکی تر نەبوو.

هەندێ پشووم هاتەوە بەرو پێشمەرگەکانیش گەیشتن. چەکی دیلەکانیان کۆکردەوەو. پێشتر دەستم بەسەر تفەنگێکی تریش دا گرتبوو. بۆیە دام بەبرۆهەسکی. فرۆکە پێکراوەکە لە ئێمە نزیك بوو. چووین بۆ سەیر کردنی. بەداخەوە کەسێك لە ئاگرییەکان شارەزایی لە فرۆکەوانی نەبوو. بۆیە تۆپەکەی ناوی لێ کرایەوە لەسەر دەستوری

فەرمانـدەش فرۆکـەکە پر لە گیای ووشك کرا سەرکردەو ئەحمەد حاجی و برۆ لە نزیك فرۆکـەکـە مانـەوەو ئەوانی تر دوورکەوتنەوە. ئەوانیش دوای ئەوەی ئاگریان بەردایە فرۆکەکە ئەسپەکانیان بەرەو لای هەڤاڵەکانیان تاوداو دوور کەوتنەوە.

ئیتـر فرۆکـەکـە تەقیەوەو پارچەکانی بەئاسمانا بالیان گرت، دەنگی ئەو تەقینەوەیە زەنگی سەرکەوتنی کوردەکان بوو بەسەر رۆمیەکاندا. کاتێ جەنگاوەرەکان گەیشتنەوە نزیا ئاگری دیلەکانیان بە دەرپێیەکی کۆڵ ئازاد کردو رەوانەی بایەزیدیان کردنەوە. ئەو شێوە بەرێ کردنـەی دیلەکـان بۆ ئەوە بوو. هەمـوو خەڵك بیـان بینن و. رۆمـەکان نەتوانن شوێنەواری شکست و راکردنەکەی خۆیان لای جەماوەر بسرنەوە.

شەو باڵی تاریکی خۆی بەسـەر ئەو قەسـابخـانەیەدا کیشاو لەبەر چاوانی وون کرد. بێدەنگی‌یەکی لە چەشنی بێ دەنگی ناو گۆرە ناوچەکەی گرتە باوەش و جێگای بێ دەنگی، دۆزەخی تۆپ و تفەنگ چۆل کرد. جیا لە دەنگی سمی وولاخەکانی دوژمن کە جەنگاوەرەکان گرتبـوویـان و پێ‌ی دەگـەرانـەوە ئاگـبری. هیچ دەنگێکی تر گوێ لێ نەدەبوو نالە نالی برینـداره تورکـە هەڵگـیرسێنەرەکانی ئەو شەرە خوێناوی‌یە گوێ‌ی مرۆڤێ کەر دەکرد. ئەمـەش پاداشتی ئەو تاوانـەیـان بوو کە دەرهـەق بەژن و منـاڵە بێ تاوانەکانی کورد کردبـوویـان. ئەو تروسکـاییـە لە فرۆکـە سوتـاوەکە بەرزدەبوویەوە هیمای ماڵ ئاوایی جەنگـاوەرە کوردەکان بوو. ئەو قنبلەو ساروخانەش کە بۆ کوشتنی ژن و منالانی کورد خرابـوونـە ناو فرۆکـەکە. دوای ئاگر تێ بەردانی فرۆکەکە یەك بەدوای یەك تەقینەوەو دەنگێکی گەورەیان نایەوە. بەمەش بانگی سەرکەوتنی ئاگری یەکانیان راهێشت.

کاتێ جەنگاوەرەکان گەیشتنە سەر فرۆکەکە. دوو منالی کوردی گوندی هەللاج بەنیازی سەیـر کردن هاتبـوونـە نزیك فرۆکەکە کاتی گەیشتنیان سارۆخێك تەقیەوەو هەردووکی کوشتن. بەو تەقینەوەیەش پەردە بەسەر تراجیدیای کانی کورك دا درایەوە.

پێش ئەوە بەماوەیەکی کەم فەرماندەی هێزە سنوری‌یەکانی تورك (میر ئالای. فەرهاد بای) هەوالی بۆناربووم و دەڵێ: بۆچی شەرکەرەکانمان بەرەو مردن راپێچ بکەین؟ با ئێمە هەردووکمـان مبارەزە بکەین. بە کوشتنی هەر یەکێکمان ئەو شەرە کۆتایی دێت. وەلامم دایەوە: ئەگەر بزانم مردنی یەکێکمان کۆتایی بەو شەرە دێنێ. ئەوا هەر ئێستاو یەکسەر ئامادەی ئەو مبارەزیە دەبم. بەلام تا ئێستا تۆ عەقلت بەوە ناشکێ کە بۆچی ئێمەی کورد شەری تورك دەکەین! ئێمە داوای سەربەخۆیی گەلی کورد دەکەین ئەگەر دەوڵەتەکەتان دان بەو ئازادی‌و سەربەخۆییە دابنێ ئەوا بێگومان ئەو شەرە کۆتایی دێت. ئەگەر مبارەزەی منیش هەر پێویست بێت. ئەوا لەگەڵ تۆدا نابێ. بەڵکو لەگەڵ سەرکردەی گەلی تورك دەبێ. چونکە منیش نوێنەری گەلی کوردم.

پێش ئەوەی لەم ناوچەیەش برۆی. ئەوا بێگومان رۆژێك دادێت لەمەیدانی شەر بەیەك بگەین.

دەمەوێ ئەوەش بزانی کەرۆژێك دادێ من بمرم. بەڵام لەناو کورددا هەزارانی وەك من هەیە.

بەڵکو لەمن باشتر هەیە. کەتۆڵەی کورد لەتورك وەربگرنەوە. ئەم شەڕو کوشتارەش لەکاتێکا دەوەستێت وکۆتایی پێ دێت. کە ئەنجومەنی باڵای گەلی تورك دان بەگەلی کوردو مافەکانی دابنێت!

هەر ئەو شەوە ئیحسان نوری دیلەکانی راسپاردوو پێی ووتن: بەمیر ئالآی فەرهادی فەرماندەتان بڵێن:ـ من ئەمرۆ هاتم. زۆر خۆشحاڵ دەبووم ئەگەر ئەوم لەمەیدانی شەر بدیباو بەیەك بگەیشتینایە. ئێوە بەچاوی خۆتان دیتتان. چ لێرەو چ لەکانی کورك. من لەپێشەوەی سوپای خۆم بووم. بەڵام بەداخەوە ئەوم نەدیت. زوو رای کرد. هەموو جارێ لەچەنگم رادەکات. پێ دەچێ گەلێ تیژ بێن بێ. پێی بڵێن لەجیاتی خۆی سوارەکانیم گرت وچەکم کردن.

بەپێی ئەو بەڵێنەی بەدیلەکان درابوو. ئازاد کران ورەوانەی بایەزیدکرانەوە.

هەروەك بڵێی ئاوی ئاووبارە سنوری‌یەکە گۆرانی بۆ ئاگری دەچری: هەتاوی ئازادیت لێهەڵات وتیشکەکانت بەسراشیان رووناك کردەوەو ئازادیت لەنێو گەل دا چاند داگیرسێ ئەی ئاگری.داگیرسێ ئەی ئاگری!

لەمەڵەندە سنوریەکانی ئێران و. لەسەر کانیاوو گردۆلکەکانی (ئایبە). بەئاشکرا شەرەکانی کانی کورك بەدی دەکرا. نوێنەری حزبی تاشناقی ئەرمەنەکان. ئەو کاتە لە ئاگری بوو. ئەویش شاهیدی گیان بازی کورد بوو.

ئاگری زیاتر سەرفراز بوو هەیبەت ومەزنی لەبەر چاوان زیاتر بوو. دەنگی گەنجەکانی ئاگری ئەو چیایەیان دەهێنایە لەرزین. ئەم پەرەگرافەی سرودی. ئاگریان دەووتەوە:ـ

**داگیرسێ ئەی ئاگری. داگیرسێ ئەی ئاگری**
**تورکەکان لەهەیبەتی تۆزراو تۆقیون**
**چاوت لێ بوو رۆمەکان چون رایان کرد**
**داگیرسێ ئەی ئاگری. داگیرسێ ئەی ئاگری.**

سەرکردەی کورد بەیاننامەیەکی بلاوکردەوە. داوای لەرای گشتی جیهان کرد بڕواننە ئەو مەسەلەیە. لە بەیاننامەکەدا هاتبوو: سەربازەکانی رۆم کاتێ بەنیازی کورد کوشتن هێرش دێننە سەر کوردستان و لەشەڕا بەدیل دەکەونە دەست کوردەکان. ئەوا یەکسەر ئازاد دەکرێن. بەڵام تورکەکان لەهێرشەکانیاندا بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە رەفتار دەکەن. دەست لەژن ومناڵیش ناپارێزن. ئەگەر چی تورك دەوڵەتێکی کۆن وبەچاوی شارستانی تێی دەڕوانن.

کوردیش کێوی. بەڵام ئایا کامیان کێویو کامیان شارستانین؟

زستان هات. بەفرو سەرما رەنگی چۆری شیریان بەباڵای ئاگری داپۆشی. هات وچوو وشەر. بەیەك دادان ودەسکەوت کەم بووبوومەوە. ئاگرییەکان ١٢ دەزگای تەلەفۆنیان دەستکەوتبوو. بەڵام تەلیان نەبوو ئەو دەزگایانە بەیەکەوە ببەستنەوەو سود لەتەلەفۆنەکان وەربگرن. شەوێك فەرماندەی کورد لەگەڵ دەستەیەك سوارە پەلاماری ئیستگەی بایەزیدیان دا. کە پایەکایەکی سەربازەکانی تورك بوو. لەبەردەم دەرگای ژووری سەرۆکی ئیستگەی هێلی ئاسن. بەپێی پێویست خۆیان تەلی تەلەفۆنیان هێنا. سەربازێك هاتە دەرەوە چرایەکی بە دەستەوە بوو. کاتێ چاوی بەجەنگاوەرەکان کەوت، خەریکی تەل بردنن لەرز گرتیو بەبێ ئەوەی ووڕتەی لەدەم بێتە دەرەوە یەکسەر گەڕایەوە ئەو ژوورەی لێی هاتبووە دەرەوە. بۆ رۆژی دوایی ژمارەیەك لە گوندەکانی ئاگری بەهێلی تەلەفۆن بەیەکەوە بەسترانەوە. جەنگاوەرەکانی ئاگری بەچاکی ڕێکخرابوون. پلەیان دابوو بە ئەفسەرو جەنگاوەرەکان. ئیشارەتی ئاگری گەورەو ئاگری بچووك. کەلەسەر بەردێکی بچووك هەڵکەنرابوو. لەرووی پێشەوەی کڵاوی سەری جەنگاوەرەکان بوو. ئەفسەرەکانیش دروشمی (خۆیبون)یان دادەنا. دروشمی خۆیبون لەخەنجەرێك کە لەناوەراستی گوڵە گەنمێك دابوو. لە بەرامبەریشیدا پەرەموچەیەکی نووسین هەبوو. ئەو سێ نیشانەیە بەیەکەوە بەسترابوونەوە. هەتاوی سەر دەسکی خەنجەرەکەش هەموو دروشمەکەی دادەپۆشی. پلەی سەر شانی ئەفسەرەکان دیاربوو.

لەزستانی ئەو ساڵەدا فەرماندەی هێزەکانی تورك هەوڵێ دەدا بە هەج ڕێگایەك بێت ئیحسان نوری تیرۆر بکات. جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکەشی بە شێخ عبدالقادر سپاردبوو. کەتا ئەو کاتەش موالی حکومەتا بوو. شێخیش زاواکەیو داقوی کورە گەورەی بڕۆهەسکی بو ئەو کارە راسپاردبوو. بێگومان ئەوان بەنهێنی نەخشەیان دەکێشا.

تورکەکان. وەکو پێویست دەرکیان بە مەسەلە مەبدەئییەکانی ئازادیو سەربەخۆیی کوردەکان نەدەکرد. پێیان وابوو مشتە پولێك بەرتیل زامنی خەلەتاندنی خەڵکە بۆ خیانەت کردن لە گەلەکەی خۆی. تورکەکان ئاگاداری ئەوە نەبوون کەئیحسان نوری ئاگاداری ئەو کەینو بەین ونەخشانەیە. هەموو ئەونەخشانە بەپرس و ئاگاداریو رەزامەندی ئیحسان نوری دەکرا. هەرچۆنی بوو تورکەکان بو ماوەیەك بەو کارە خەڵەتێنران.

بەهار هات. چیای ئاگری بەپاوانی سەوزو گوڵی رەنگاو رەنگ رازایەوە. چوارەمین بەهار بوو. ئاگری لەدەست تورکەکان ئازاد کرابوو.وبوو بوو بەجێی نەزرگەی دڵدارانی خوێن گەرمی ئازادیو پارێزەرە جەسورەکانی. لا پاڵ و لوتکەکانی بوو بووبە لانەی گەنجە ئازاو پارتیزانە دڵدارەکانی ڕێگای ئازادی رۆڵەکانی گەلی کورد. ئەو چیایە بوو بوو بەقەڵای گیانی نیشتمانپەروەرێتی... کوردستان بلێسەی تفەنگی دەستی جەنگاوەرەکان لەسەرانسەری کوردستانی تورکیادا شەوقی دەدایەوە.

پرتسکی فکرو مەبدەئەکانی ئازادی هەموو دەسەلاتێکی بیانی دەسوتاند و تێکی دەشکان و لەناوی دەبرد. ئەو ئاگرە ئاگرێکی بری دەکوژاندەوە ئاگری تورکەکانی را کێشبایە ناو کەندو شیوو دۆڵەکانی خۆیەو. لەوێ بەخاکی گرگرتووی خۆی دەیسوتاندن.

سەرکردەی کورد هیوای بەیارمەتیو پشتیوانی هیچ جێگاو ناوچەیەك نەبوو. بەپێی پێویستی رزگارکردنی ناوچەکانی ترو بەرفراوانکردنی مەیدانی شەڕ چەك و تفاقی شەڕیان دەست نەدەکەوت. ئەو راستیەشی باش ئەزانی کە رووبەڕوو بوونەوەی تۆپ و فڕۆکەو تانکی سوپـای باش مەشق پێکـراوی تورك کارێکی قورسە. جەنگاوەرەکان ئەبوو تەنیا

بەتفـەنـگ بەرسنگی هێـزەکانی دوژمن بگرن. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەی کورد ئەمەش دەزانیّ کە هێـزەکـانی کورد بە گیـانفیـداکـاری و نیشتمان پەروەریو لە خۆبوردویی دەســەڵاتی خۆیان بەسەر چیای ئاگریدا فەرز کردووەو دەیپارێزن. هێزەکانی دەوڵەتی تورك هیلاك و ماندوو و لەت لەت دەکەن.

بەپیـادەکـردنی تاکتیکـەکانی توانی دەنگی نالەی هەژاران و ئیرادەی بە هێزی گەلی کوردی تێکۆشەر. لەپێناوی ئازادی یە نەتەوایەتیو نیشتمانیەکان بکەیەنێتە گوێی رای گشتی جیهان و دەسەلاتیسیاسیو ئابوری تورکیا بلەرزێنێ. ئەو جم و جوولە تاکتیکیانە جێگای رەزامەندی و سوپاسی لیژنەی مەرکەزی حیزبی خۆیبوون بوو

دەوڵەتی تورکیـا. سوودیـان لەتـاقی کردنەوەکانی رابردووی خۆیان وەرنەگرت. ئەم جارەش وەکو جارەکانی پێشوو هەمان رێگای کۆنییان گرتەوە بەر لە شەری بەلقانی ساڵی ١٩١٢ گوێی بە مەسـەلەی ماف و ئازادی نەتەوەیی ئەرنائوت نەدا کاتێ تورکیا خاکی بەرفـراوانی رومـلی (بەشی ئەورووپای تورکیای ئێستا. لای تەراقیـاوەرگێری عەرەبی) لە دەستدا. جامی رق و تورەیی خۆی بەسەر عەرەبەکاندا رشت. رەفتاری نامرۆڤانەی جەمال پاشـای وەزیـری دەریـای تورك و. لەسێـدارەدانی سەرکردەکانی عەرەب لەشام جێگای بێزاریو نارەزاییەکی زۆری عەرەبەکان بوو. سەرەنجام راپەرینی شەریف حسێن لە مەککە هەموو خاکی عەرەبی ژێر دەسەلاتی تورکیای رزگار کرد بەڵام تورکەکان بەمەش هەر قایل نەبوون. تورکەکان لەئەنجامی تیروانینییان تورانیزم نەیان دەتوانی دەرك بەو راستییە بکـەن کە ئاری نەژادەکـان دیوارن لە رێگای گەیشتنیان بە مەرامە چاو چنۆکیەکانیان. بەتـایبـەتی نەیـان دەتـوانی جیـابـوونـەوەی کوردستـان کە دانیشتوانەکەی $\frac{2}{4}$ ی دانیشتوانی تورکیایە دەرك پێ بکەن. بۆیە هەمیشە دووچاری هەڵە دەبون. بەمەبەستی سەقامگیر کردنی رێکخستنەکانی خۆیبوون لەکوردستان دا پێکهێنانی مقاوەمەتی گشتی. بە پێویستم زانی چەند دەستەیەکی چەکدار رەوانەی قولایی کوردستان بکەم. بۆ ئەوەی چەکـدارانـەلەلایەك هێزەکانی تورك مەشـغـول بکـەن. لەلایـەکی تریشــەوە جەمــاوەر لەرێکخستنەکانی خۆیبوون رێکبخەن. ئەگەر چی ژمارەی ئەو دەستانە زۆر کەم بوون.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەگەیشتنە قوڵایی کوردستان. لەناوچەی سەخت وعاسێکاندا ئەرکەکانیان بەهێزەکانی ناوچەکە دەسپارد. بەمەش حکومەتی تورکیا نەك هەر لەنزیکـ ئاگرییەوە. بەڵکو لەسەرانسەری کوردستان. بەئاگری ئازادییەوە دەسووتا.

ئاگری مەیدانی بەیەکا هەڵچوونی ئاگری نێوان کوردو تورك بوو. ژمارەی ئاگرییەکان زۆر نەبوو. سەرباری ئەوەی کە کێڵگەی کشتوکاڵ زۆر کەم بوو. بەڵام ئەوەی هەش بوو لەژێر رەحمەتی ئاگری تۆپەکانی تورك بوو. بۆیە کەسێك نەیدەتوانی ئەو زەوییانە بەناو بێنێت. ئەوەی دەستی تفەنگی بگرتایە رووبەرووی دوژمن دەوەستاو بەرسنگی لێ دەگرتن. ئەوانە سنگیان کردبووە قەڵغانی ئازارو کۆلە مەرگی کوردستان و رووبەرووبوونەوەی سوپای گەورەی کۆماری تورکیا. بەمەش ئەرکێکی گەورەو قورسیان گرتبووە ئەستۆ. ئەویش رزگارکردنی کوردستان بوو. ئەوجەنگاوەرانە دووچاری جۆرەها ئاستەنگ و هیلاکی دەبوونەوە. رووبەرووی مەترسی گەورەو گیانبازی دەبوونەوە. بەڵام لەناخەوە. لەژێر ئاڵای شەکاوەی کەلەکەیاندا هەستیان بەئارامییەکی سایکولۆجی مەزن دەکرد. ژیان لە ئاگری ئاساییو خۆش بوو گەلێ جار یاری سوار سوارانێو نیشان دانانیان دەکرد. گەلێ جار لەیارییەکانیان گوللەو تۆپیشیان بەکاردەهێنا لەکاتی یاری شەرەکانیشدا یارییان بە گوللەو تفەنگ دەکرد. بۆیەهەمیشە پێویستیان بە فیشەك هەبوو. ترس و بێ ئومێدی هەرگیز نەیان دەتوانی زەفەر بەئاگری ببەن.

دوای شەری کانی کورك وورەی دانیشتوانی ئاگری بەرزترە. بیروباوەریان سەقامگیرو بەهێزتربوو. بڕواییەکیئەوتۆیان بەخۆیان هەبوو کە دەیان ووت: تیپێکی سوپای تورك ناتوانێ هێرشمان بکاتە سەر. لە راستیشدا هەروەکو دەیان ووت وابوو.

داوای ئەوەی (زوهدی گویفن) ئەفسەری تورك گەیشتە وەدەکەی دەربارەی شەرەکەی نێوان سەربازە تورك و کوردەکان نووسی: لەشەری ئوسمان کلەم(ئالتون دش) کەلە نزیك ناوچەی شەمکان و تورلجە (پێشتر پێیان دەووت فولق. نێوان ئگدو ـ فاخرمان) رووی‌دا هێزەکانی سوپای تورك تێك شکان. رۆژی دواتر لەگەڵ تابورێك سەرباز چووینەوە مەیدانی شەرەکە. چوارلاشەی سەربازمان دۆزییەوە. بەپێی دەستووری سەربازی ناشتمانن رۆژی دووەمین چیاوشیوەکانی ناوچەکە گەراین لەنزیك هۆبەی خێلی شەمکان چوار کوردمان لەشیویکا گرت و .گەراینەوە بنکەکانی خۆمان.

ئەوانەی گیرابوون. بێگومان شوان بوون و بەبێ هۆ گیرابوون و بردبویانن. دەوڵەت بریاری هێرشێکی سەربازیدا بۆ سەر خێلی شەمکان کە تەیمور ئاغا سەروکیان بوو. ژەنەراڵ صبحی فەرماندەی ناوچەکە. هەندێئامۆژگاری بۆ هێزەکەی بڵاوکردەوە. دوای دەست پێکردنی هێرشەکە شەو لەگوندی کاپلوچە مانەوە. لەوێ رووداوێکی دڵتەزین روویدا زوهدی گویفن لەوبارەیەوە دەڵێت: خەوتبووین. لەگەڵ دەنگی تەقە خەبەرمان بویەوە. گوێمان لێ بوو یاوساوڵەکە دەڵێ: لێرەوە رای‌کرد. بیرەدا رۆیشت هەموومان

به تەواوی جلەکانمانەوە نووستبووین. تفەنگ و دەمانچەمان لە ژێر سەری خۆمانەوە دانابوو. هەموومان بە پەلە چووینە دەرەوە، بینیمان (ئامو) پێستی بەرانیکی لەبەر کردبوو، وکەوتبووە ژێر خەرمانی ئالیک، لەوێ دەریان هێنا، ئامۆ دوو گوللەی پێوەبوو یەکی لە گوللەکان بازوی هاری بوو.

گوللەی دووەم بەردەستی راستی کەوتبوو کەتفەنگی پێدەگرت. ئەگەر چی برینەکەی سەخت بوو. ونەیدەتوانی کاری بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدەستە زامدارەکەی تفەنگەکەی لەئامێز گرتبوو هەرچەندە بەدەستی دوو سەربازەکان چەکەکەیان لێ سەندبوو و هێنایان بۆ چادرەکانی خۆیان. لێیان پرسی: بۆچی پێستی بەرانت لەبەر کردووەو هاتویتە ناوگوند. ئەشت زانی ئەو هەموو سەربازەی تێدایە؟ لەوەڵامدا ووتی: بۆ تۆڵە سەندنەوەی برایم فەتۆ هاتووم ویستم هەڵبکوتمە سەرچادرەکانی ئێوە (مەبەستی لەئەفسەرەکان بوو) وبتان کوژم بەڵام لەبەدبەختی یاساو لەکەتان بەدی کردم.

پێش ئەوەی بگەمە چادرەکەتان برینداری کردم. ئامو لەخێڵی شەمکان و لەدەستەی کەرەم قاسو بوو. هەربەو برینەو لەئەنجامی خوێن لەبەر ڕۆیشتنێکی زۆر مرد. بەڵام کورد بەهەر رێگایەك بێت تۆڵەی خۆیان دەسێننەوە. وا دەردەکەوێت ئەو کوردە لەئەنجامی خوێن لەبەر رۆیشتنی برینەکەی نەمردبوو. بەڵکو لەناو چادرەکە کوشتبوویان. ئەوەش رەفتاری درندانەی ئاشکرای تورکە بەرامبەر بەبریندارە کوردەکان خوا پشتیوانی زوڵم لێ کراوو چەوساوانە. ئەمەش نموونەیەك بەڕاستی قسەکانمان: (ڕۆژێکی تر هێزەکانی تورك لەرێگای قەرەکوسە هەندێ کەسیان لە خێڵی شەمکان گرت و پێش خۆیان دان و بردیانن. زۆهدی گویفنی ئەفسەری تورك لەم بارەیەوە دەنووسێ و دەڵێ: (١٥) دیلی کوردی دەست کەلەپچەکراومان پێبوو، لەنزیك گوندی باڵکلکول. لەلایەن هەندێ کورد درایە بەشێلکی گوللە. دیلەکان لەنێوان تەقەی هەردوو لادامانەوە. سەرەنجام هەموویان کوژران). راستی ئەورووداوە ئەوەیە کە تورکەکان ئەو (١٥) کوردەیان بردبووە شاخەکان و لەوێ بە گوللە هەموویان کوشتبوون. لەبەرئەوەی تورکەکان خۆشیان هەستیان بەسوکی و بەد رەفتاری ئەوکارەی خۆیان کردبوو وبۆیە بەوشێوە لەرۆژنامە بڵاویان کردەوە. شێخ عبدالقادر لەگەڵ داروودەستەکەی خۆی روویان کردە چیای ئالاداغ. ئاگرییەکان پێیان خۆش بوو شێخی موانی حکومەت بێتە گۆشەیەکی ئاگری و بۆخوی لەوێدا بنیشێ، بۆجێبەجێ کردنی ئەو هیوایەش سەرکردەی کورد نەخشەیەکی دارشتبوو.

بەشی زۆری خێڵی هەسەسورو خێڵی فوتان کە موالی دەوڵەتی تورکیابوون. پەیوەندییەکیشیان لەگەڵ ئاگرییەکان هەبوو. سەرکردەی ئەوخێلانە بە نهێنی پەیوەندیان بەدەوڵەت کردبوو. پێیان ڕاگەیاندبوون کە شێخ عبدالقادر پەیوەندی بەئاگرییەکانەوە هەیەو. بۆمەسەلەیەکی تایبەتی و لەسەر داواکاری ئاگرییەکان

بچێتەچیای ئالاداخ، هەروەها ئەو خێلانە رەزامەندی دەوڵەتیان وەرگرتبوو لەرێگە پێگرتنی شێخ عبدالقادر بۆ چیای ئالاداخ. بۆیە هێزەکانی خێڵی هەسەسوری‌و قوتان لەنزیک قزل دزد ریگایان لە شێخ عبدالقادر گرت.

دوژمنیایەتی شێخ عبدالقادر لەگەڵ ئیحسان نوری‌و، هاوکاری کردنی لەگەڵ دەوڵەت بەو بەری ئارەزووی خۆی‌بـوو. بەڵام کۆششیـان بۆ کوشتنی ئیحسـان نوری لەوەوە سەرچـاوەی هەلگرتبوو کە شێخ عبدالقادر جلەوی ئیرادەی خۆی دایەدەست دەوڵەت، عەلۆ بەشوکە لەخێلی شەمکان بوو تەسلیم بەدەوڵەت نەبوو، ماڵەکەشی هاوسێی ماڵی شێخ عبدالقادر بوو ئەو خۆتەسلیم نەکردنە جێی نارەزایی شێخ بووبۆیە چەکدارەکانی خۆی نارده سەرمـاڵەکـەی تا ئابلوقـەی بدەن و بیگـرن. شەر لەنێـوانیان هەلگیرسا. دەستـەیـەك لە جەنگـاوەرەکـانی ئاگـری بۆ پشتیـوانی عەلۆ بەشو چوون لەئەنجامی شەرەکـەدا چەکـدارەکـانی شێخ شکستیان خواردو کشانەوە، پاش تێپەربوونی مانگێك بەسـەرئـەو رووداوەدا. کاتێ عەلۆ بەشو لەناو خاکی تورکیا بوو. وماڵەکەیان بی پیاو مابـوونـەوە، شێخ عبدالقادر جارێکی تریش چەکدارەکانی خۆی ناردەوە سەرماڵی عەلۆ بەشـوو تالانیـان کرد. ئەو رۆژە تاژدین لە خێـلی زرکان لە ماڵی عەلۆ بەشو میوان بوو. پیاوەکانی شێخ لەگەڵ کـۆمەڵێ خزمەتکارو شوان بەدیلیان گرت. کـاتێ شێخ لەدوورەوە تاژدینی بەدی کرد پرسی ئەوپیاوە کێیە؟ لەبەر ئەوەی جل و بەرگی تاژدین لەجل وبەرگی ئیحسـان نوری دەچـوو. بۆیــە ووتیـان: ئیحسـان نوری‌یـە. شێـخ نارەحـەت بوو. بەتـوورەییـەوە ووتی: ئێنجـا من چی‌لێبکەم؟ نەدەتوانم بیکوژم. نەدەشتوانم بیدەمە دەست دەوڵەت، چونکە ئەوکاتە هەموو کوردەبێتە دوژمنم.

دەوڵەت هەوڵی دەدا دووبەرەکی‌و دوژمنایەتی بخاتە نێوان خێلەکانی کورد. دەبوایە هەرچـۆنێ بێ تۆوی جیابونەوەو ناکۆکی بخاتە ناوبەشێك لەو خێلانەی لەژێر سایەی ئازادی‌و لەئاگری‌دا دەژین. لەپێناوی هێنانەدی ئەو مەبەستەش دەوڵەت داواکاری‌یەکانی خێلی (قوتان) وهەسەسوری پەسندکرد بەڵام درەنگ بوو. تورکەکان نەیاندەتوانی تێبگەن ئەوانـەی بەئـازادی‌و بێ دوودڵێ گیـانی خۆیـان دەکـەنـە قوربـانی سەندنەوەی مافە نەتەوەییەکان. هیچ هێزێك نیە هەروا بەئاسانی بتوانێ دووبەرەکیان لە نێواندا بچێنێ. مەسەلەکەی شێخ عبدالقادریش نموونەیەکی تایبەتیە لەوبوارەدا.

خـێـلی شێـخ عبـدالقـادر لەرێگـای ئالاداخ دا، رووبـەرووی شێـزی خێلەکـانی هەسـەسـوری‌و قوتان بوونەوەو پاش شەرێکی کورت رێگایان کردەوەو گەیشتنە چیای ئالاداخ. پێشتـر قایمقـامی بایـەزیـد لەتـرسی کوردەکـان جێگای خۆی لەگەڵ قایمقامی قەرەکوسە گۆری‌بوو.لەگەڵ ئەوەشدا زۆربێ شەرمانە هەر خۆی بەوالی بایەزید دەزانی. بۆیە رۆژێك بە دوای شێخ عبدالقادری ناردو داوای کرد سەردانێکی بکات. بەڵام شێخ بروای بەدەوڵەت نەمـابـوو. نەشی دەزانی مەبـەست لەودیـدەنیـە چیـە. خێلەکـانی

هەسەسوریو ڤوتان دوای ئەوەی نەیانتوانی رێگا لەخێلی شێخ بگرن. دەوڵەتیان واتێ گەیاند کەشێخ یاخیبووەو بەتەواوی سەر بەئاگرییەکانە. هەندێ لەشەخسیەتە نیشتمان پەروەرەکانیش بە شێخیان ووت ئەروێ باشە. دەوڵەت دەیەوێ زیندانت بکات شێخیش بەقسەی کردن و خۆی نەروێشت. بەڵکو براکەی و شێخ حەسەنی زاوای نارد خێلەکانی هەسەسوریو ڤوتان بەیێ پرسراوەکانی تورکیان ووت: ئەوە بە چاوی خۆتان بینیتان کە خۆی نەهات. هەر لە ئێستاوە سەرپێچی دەکات، بەم جۆرە لە بن گوێ خوێندنی دەوڵەت لەلایەن ئەودوو خێلەکاری خۆیکرد. والی بایەزید لەیاخی بوونی شێخ کە تادوێنێ موالی دەولەت بوو دلنیابوو.

لەراستیدا ئەو هەموو شتانەی کەبوون بەنەخشەو دەسکردی فەرماندەی کوردبوو. ئەگینا شێخ لە واقیعدا موالی دەوڵەت بو. لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەت بەیەکەوە نەخشەیان بۆ کوشتنی من دادەنا.

مەبەستی دوژمن لەو هەموو کارانەیدا چاندنی تۆوی دوژمنایەتی بوو لەنێوان خێلەکانی کورد. چونکە بەشێك لە خێلەکانی هەسەسوریو شاکی لەریزی تێکۆشەرەکانی ئاگریبوون و خەباتیان لە پێناوی ئازادیو مافەرەواکانی گەلی کورددا دەکرد. دەوڵەتیش دەیویست گیانی دوژمنایەتیان بخاتە نێوان و بەرێگای سیاسەت هێزەکانی ئاگری لەیەکتر دووربخاتەوە. دوژمن بەهەمووتوانایەوە ئەو سیاسەتەی پیادە دەکرد. هیوای زۆریشی پێبوو. بێ ئاگابوو. لەوەی کە هیچ هێزێك ناتوانێ جیاوازی بخاتە نێوان ئەوگیانبازانەی ئامادەی مردنن لە پێناوی ئازادی گەلەکەیاندا.

ئاگرییەکان بەشاخەکانا سەرکەوتنەوەو چوونەوە مێرگ و پاوانەکان، فەرماندەی هێزەکانی تورکیش فەیلەقێکی لەهێزی پیادەو چەندین تۆپ لەسەرگردی (لوتە سوور)ی بەرامبەر پردی تاویری شێخلوی نزیك سنووری ئاگری ـ تورکیا دامەزراندبو.

هەروەها فەیلەقێکی تریشی لەسەر (لوتەرەش)ی بەرامبەر بارەگای ئیحسان نوریو بروهەسکی لەگوندی کورد ئافا دانابوو. هێزەکانیتورك سەنگەرەکانی خۆیان قایمکرد هێزە سنوورییەکانی سەرتاسەری مەڵبەندە سنوورییەکانی ئێرانیان زیاترکرد. بەو تۆپانەی لەسەر لووتە سوور دامەزرا بوونکیلکەکانی نێوان کورد ئافاو شێخلۆیان تۆپ باران دەکرد. ئەوتۆپانە هەرهەمان تۆپ بوون کەلەساڵی ١٩٢٢ لەژێر فەرماندایەتی ئیحسان نوری بوو کەئەوێ رۆژێ فەرماندەی هێزی سنوورییەکانی تورکیا ـ ئێران بوو لە ناوچەی بایەزید. بەڵام کاتێ ئیحسان نوری لەوێ بەرەو ئاگری کشایەوە نەیتوانی تۆپەکان لەگەڵ خۆی ببات بۆیە لەوێ جێی هێشتن.

فەرماندەی هێزەکانی تورك واتێگەیشتبوو بەو کارەی دەتوانێ ئابلۆقەی هێزەکانی ئاگرن بداو رێگای هات و چوویان ببرێت. بەڵام چۆن دەتوانن ئەو کارە بکەن کاتێ

تورکەکان خوێنی تازەیان دەکردە دەماری هێزەکانی خۆیان، ئاگرییەکانیش لەبەرامبەر ئەواندا ژمارەیان زیادی دەکرد. عومەر بەسێ سەرۆك خێڵی کەلتوری ـ لەگەڵ خێڵەکی لەلای باکـوری ئاگـری، لەناوچەی ئەگدەر نیشتەجێ بووبوون

لەلاکەی تری

چیاکە عەلۆی بەکرو عەبدوڵلا خەلەف سەرۆکی خێڵی قزلباش ئوغلی کەیەکێك بوو لە بەناوبانگ ترین لاوی کوردی ئازادی خوازو ئازا نیشتەجێ بوون. کە ماوەی چەند ساڵێك پێش لەگەڵ بەشێك لەخێڵەکەی لە ئێران هاتبوون و لە نێو کوردەکانی تورکیا لە رۆژهەلاتی ئاگری نیشتەجێ بووبوون. هەروەها ئەنوەر مزراف لە بنەماڵەی سەرۆکەکانی خێڵی زیلان. هەموو ئەوانە لە هێزەکانی ئاگری بوون. بەم جۆرە مەلبەندی باکوری ئاگری لەگەڵ هێزەکانی ئاگری یەکیان گرتەوە. هەندێ لە کوردە نیشتەجێکانی بەشی باکوری چیا هێشتا وازیان لە موالێنی بوون و دەوڵەتی تورکیا نەهێنابوو. بەڵام لەگـەڵ ئەواندا هەتاوی ئاڵای ئازادی کوردستان بە تیشکـی خۆی هەموو دەوروبەری چیای رووناك دەکردەوە. هیچ کەسێکیش لەکارمەندەکانی دەوڵەت ئازایەتی ئەوەی تێدا نەبوو رووبکەنە چیاکان.

## ئەردەشێر موراديان

ئەو ساڵە ساڵی ۱۹۲۹بـوو. پێنجـەمین تەمەنی شورش بوو. ئێمەچووبووینەپاوانەکانی (زۆزان) کاتێ پیاوێکی کورد هات و دیارییەکی بۆ ئەردەشێر موراديان هێنا کەنوێنەری ئەرمەنە تاشناقەکان بوو لای ئێمە، دیارییەکەی لەگەڵ نامەیەك بە ئەردەشێرد او پێی ووت : (کوری مامت لەتەفلیس هاتۆتە یەریڤان بۆ چاوپێ کەوتنی تۆ. ئەم دیاریو نامەیەی بۆ ناردی). لەنامەکە هاتبوو: ( بیستم تۆ لە چیای ئاگری، حەزم کرد چاوم پێت بکەوێت. بۆ ئەم مەبەستەش هاتمە یەریڤان). رۆژێك وەرە ئارالق. کەناری ئاوی ئاراس. منیش دێمە ئەوێو لەوێ یەکتر دەبینین. ) تورکەکان دەیان ووت: ئارالق خاکی تورکە. رووبەرووی رووباری ئاراس. بەڵام لەواقیع دا لە ژێر دەسەڵاتی ئاگری یەکان بوو. ئاوی ئاراس هێڵی سنووری نێوان تورکیاو روسیا بوو!

ئەردەشـێر سووربوو لەسەر بینینیکورە مامەکەی. چونکە ماوەی چەندین ساڵ بوو یەکتریـان نەدی بوو. سەرکـردەی کورد پێی خۆش نەبوو بە تەنیا. بروات. بۆیە ۱۵ سواری بەفەرماندەیەتی عومەر بەسی کەلتوری لەگەڵ ناردو پێی ووتن: نەکەن لەرووباری ئاراس بپەڕنەوە. ئەوبەری رووبارەکە خاکی رووسە ناوچەی ئارالق زەوییەکی رووت و بێ دارو درەخت و دەوەن بوو. هیچ سیبەرێکی سروشتی ئەو تۆی لێ نەبوو مرۆڤ بتوانێ لەسـایـەیـدا بحـەسێتەوە. بەڵام دیوی روسیا تەواو بە پێچەوانە بوو. دارو دەوەن و درەختێکی زۆری لێ بوو ئەفسەری سوفیەتی. سەرۆکی مەلبەندی سنوری پێی‌وت:

کوری مامت لە بەریڤانە هەر کا تێك ئاگاداری بکەمەود دێز

ئەردەشێر زانی ئەفسەرەکە ئەرمەنیە بۆیە بەزمانی ئەرمەنی قسەی لەگەڵ کرد. بەلام ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوەو ووتی: من زمانی ئەرمەنی نازانم» ئەردەشێر وەڵامی دایــەوە و ووتی: «من دەزانم تۆ ئەرمەنی» ئەفسەرەکە نکوڵی کرد. پاشان بەزمانی روسی قســەیــان کرد. ئەفســەرە روســەکــە ووتی: بۆ چی بەو فرچــەی نیوەڕۆیە لەبەر هەتاو وەستــاوی؟ وەرە ئەم بەر. لەژێر سێبەر ئیستراحەت بکە تا کورە مامەکەت دێت! راست دەڵێم ئەگەر بڵێم لای ئێمە وەکو پولوی ئاگر دەسووتا. بۆیە ئەردەشێر ئاوری دایەوە لای عومــەر بەسێ و پێی ووت:ـ ئەفســەرەکە راست دەڵێ. وەرە بالە رووبارەکە بپەڕینەوەو بچینە لایان. عومەر بەسێ وەڵامی دایەوە: ئەی سەرکردە نەیووت نەکەن بپەڕنەوە ئەو بەر؟ ئەر دەشێر و وتی:ـ سەرکردە نەیدەزانی ئێمە لێرە ماوەیەکی زۆرمان پێ دەچێ. ئەگەر ئێوە نایەن من بە تەنیا دەچم کاتێ عومەر بەسێ زانی ئەردەشێر تەنیا دەچێتە ئەو بەر. چوار سواری هەڵبــژاردو دوای کەوتــن بۆ ئەو بەرو نەیــانــهێــشت تەنیــا بێت. بەم جۆرە لەرووبارەکە پەرینەوەو چوونە مەلبەندی سنوری روس. بەڵام سوارەکانی تر هەر لەوبەر مانەوە.

ئەفسەرە روسەکە ووتی: مەڵبەندی سنوریمان زۆر لێرە نزیکە. کوری مامیشت دێتە ئەوێ. بفەرموون با بڕۆینە ئەوێ. لەوێش دەتوانین باشتر خزمەتتان بکەین. بەو جۆرە چوونە ئەوێ. کاتێ لە دەرگای بارەگای مەڵبەندەکە چوونە ژوورەوە روسەکان بەساردی پێشــوازیــان کردن. چەکیــان کردن و ئەسپــەکــانیــان لێ سەنــدن. کاتێ عومەر بەسێ بە ئەردەشێری ووت: من هیچ لێ یان دڵنیا نیم. نیازیان بەرامبەرمان پاك نیە.

شتێکی ترسناك لەمەسەلەکەدا هەیە. ئەردەشێر ووتی: ئەمنیش خەریکە گومانم لا پەیدا بێت» سەعاتێك تێ پەری. هیچ هەواڵێکی کوری مامی نەبوو. لە بەر ئەوەی عومەر بەسێ پیاوێکی زیرەك و ووردو تاقی کردنەوەی ژیان قاڵی کردبووە. رووی کردە ئەردەشێرو پێی ووت: من هەوڵ دەدەم بە هە ج رێگایەك بێت خۆم رزگار بکەم. ئەردەشێر وەڵامی دایەوە، من ناتوانم. بەڵام ئەگەر تۆ ئەو کارە لە خۆت رادەبینی بیکە!

## راکردنی عومەر بەسێ

عومــەر بەسێ چووە لای لێ پرسراوی مەلبەندەکەو پێی ووت: سوارەکانم لەو بەری رووبــارەکــە مــاونەتەوەو فرچەی هەتاوەکە دەیان سوتێنێ. دەمەوێ بچم و ئەوانیش بینمە ئەم بەرە رووسەکان بەو قسەیە خوشحال بوون و ووتیان زۆرباشە!

ئەسپێکیان بۆ هێنا بۆ ئەوەی سواری بێت. کە دینی ئەسپەکەی خۆی نیە پێی ووتن: ئەبێ بە سواری ئەسپــەکــەی خۆم و بەچەکەوە بچم. ئەگەر بەچەك و ئەسپەکەی خۆم

نەچم. ئەوان وا دەزانن کە ئێوە چەکتان کردوین و ئەسپەکانتان لێ سەندوین. ئەوسا لەگەڵم نایەن. روسەکان قسەکەی ئەویان پێ باش بوو. ئەسپەکەی خۆیان بۆ هێناو چەکەکەشیان دایەوە. سواری ئەسپەکە بوو و. رووەو سنور بەرێ کەوت ئەفسەری بارەگا سنوری‌یەکە پێ‌ی ووت: بانگیان کە. داواڵە سوارەکان بکە بپەڕنەوە ئەم بەر: عومەر بەسێ وەڵامی دایەوە: ئەوانە کوردن. وەکو سەربازەکانی ئێوە رێك نەخراون. ئەگەر خۆم نەچم تێیان نەگەیەنم نایەن. زۆر پێویستە خۆم بچم وبیان هێنم. ئەفسەرەکە بەناباەدڵی رازی بوو. عومەر بەسێ لەرووبارەکە پەری‌یەوەو گەیشتە ناو سوارەکان و پێ‌ی ووتن:

زوو سواری ئەسپەکانتان بن. بەپەلە رکێب لێ بدەن بەرەو ئاگری. بەم جۆرە توانی لە چنگ روسەکان دەرباز بێت. ئەردەشێرو چوار سوارە کوردەکەشیان. بەدەست بەسەری بردە یەریڤان. جلەکانیان گۆڕین پاشان بردیانن بۆ تەفلیس و زیندانیان کردن.
لە رێگای مەڵبەندی سنور. نامەیەکم بۆ روسەکان نارد. داوای ئازاد کردنی ئەردەشێرو چوار سوارە کوردەکانم کرد. پاش چەند رۆژێك چوار سوارە کوردەکانیان هێنایەوە یەریڤان. دوای ئەوەی چەك و ئەسپ و جلەکانیان دانەوە رەوانەی ئاگریان کردنەوە. سەرکردەی کورد نامەیەکی تری ناردو تیایدا داوای کرد ئەردەشێر ئازاد بکەن. نامەکەی دایە سەید رەسول و چەند سوارێکیشی لەگەڵ نارد، بەڵام کاتێ سوارەکان لەرووباری ئاراس نزیك بوونەوە. لەلایەن مەڵبەندی سنوری روس درانە بەر شیلکی گوللە. لەئەنجام دا سەید رەسول بریندار بوو. بەبێ ئەوەی نامەکە تەسلیم بکەن گەرانەوە.
چەند رۆژێك دوای ئەو رووداوە. بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو کارەی روس. دەستەیەکم لەسوارەکانی ئاگری ناردە سەر یەکێ لەشارە ئەرمەنیەکان. کەدەکەوێتە باکوری رۆژ هەڵاتی ئاگری و لەسەر لێواری رووباری ئاراس بوو. جەنگاوەرەکانی ئاگری بەر ئاگری مەترە لوزەکانیان شەویان لێ کردن بە رۆژ. پاشان زانیم ئەردەشێریان بۆ سیبریا دوور خستەوە.

# حوسین پاشاو حاجی موسی بەگ

لە ناوەراستی هاوینی ساڵی ١٩٢٩ دا. مەمۆ.نادر دوو کوری حوسین پاشای سەرۆك خێڵی حەیدەری. لەگەڵ دوو براو ئامۆزایەکیان. لە سوریاوە هاتنە ناو خاکی کوردستانی تورکیا.
دوای برینی ناوچەکانی مدیات. بیشیدو گرزان وپشتی موش. هێزەکانی تورك‌لەیەکێ لەئەشکەوتەکان پەلاماریان دان و سی‌یان لێ بەدیل گرتن و پاشان کوشتیانن دووانەکەی تر مەمۆو نادر رزگاریان بوو و خۆیان گەیاندە لای ئێمە لە ئاگری.

حوسـێن پاشا کۆر. سەرۆکی گەورەی خێلی حەیدەری و بەدەسەلاتدارترین سەرۆکی ناوچـەکانی دەوروبەری (وان و بایەزید) بوو. حاجی موسی بەگی سەرۆکی ووردبێن و خاوەن دەسەلاتی ناوچەی موشیش برادەری بوو. ئەو دوو سەرۆکە لە سەر ئەوە رێکەوتن کە ئەنجـومـەنی سەربـەخـۆیی کوردستـان بەسـەرکردایەتی عەقید خالد بەگ جبرانی دابمـەزرێنن. کاتێ من بە ئاگـاداری کۆمەڵە ئاگری شۆرشم لەناوچەی (بەیت الشباب) هەگـیرساندو پاشان سەرکەوتوو نەبووم. یەکێ لەهەڤاڵەکانم. ملازم أول عالی رەزا بەگی (یـوسف زیا بەگی نوێنەری بەدلیس لە یەکەمێن ئەنجومەنی کۆماری تورکیا. لە هەمان کاتیش دا لە ئەنجومەن ئەندام بوو) گیرا. هەروەها براو فایق بەگی زاوای گیران. ئەنجومەن حەل کراو سەرۆکەکەی خالد بەگ جبرانی گیراو لە رێگای ئەرزەروم ـ قەرەکوسە ـ پانتوس ـ ئەرجیش ـ ئادلجوار رەوانەی بەدلیس کرا. (شیاو ی باسە کورت ترین رێگای ئەرزەروم ـ بەدلیس بەخنس و موش دا تێدەپەری بەلام بەناو ناو خێلی جبرانی دا دەروات. سەربازەکانی دەولەت ئەو رێگا کورتەیان نەگرت. چونکە دەترسان خێلی جبران راپەرن و خالد بەگیان لە دەست رزگـار بکـەن). خالد بەگیـان خستـە زیندانی بەدلیس. لە کاتی تێپەربوونی بە ئەرجیش (جێگای نیشتەجێ بوونی حسێن پاشا کور) خالد بەگ لە دلێ خۆیا چاوەروانی ئەوەی دەکرد حسێن پاشا بە هاواریەوە بچێ و لە دەست ژەندرمەکان رزگاری بکات. چونکە بە ناوەراستی خێلی حەیدەریدا تێ دەپەرین. ئەگەر چی خالد بەگ یەکێکیشی نارد بۆ لای حسێن پاشا بۆ ئەوەی فریای بکەوێ و دەربازی بکات. بەلام حسێن پاشا لەشوێنی خۆی نەجولا! حاجی موسی بەگیش گیراو رەوانەی بەدلیس کرا.

× × ×

خالد بەگ جبرانی و حاجی موسی بەگ لە بەدلیس زیندانی کران. پێشتریش ملازم عالی رەزاو یوسف زیا بەگی برا گەورەی (کە پێشتر باسمان کرد) نائب بوو لە ئەنجومەنی بالای تورکیا. بەتومەتی بەشداری کردن لە راپەرینی شێخ سەعیدی پیران زیندانی کران. بەلام حسـێن پاشـا ئازادو لە نێو خێلەکەی خۆی بوو. ئاگری راپەرینی خێلەکانی جبرانی و زرکـانی و هەسنـان درێـژبـووە،وە بۆ خێلی حەیدەرانیش. داوایان لە حسێن پاشا کرد وەفـاداری بەلێنـەکەی بێت و. هاوکاری شۆرش بکات. بەلام وەلامی نەبوو!. ئەو پیاوە دەولەمەندو خاوەن قۆناغ بوو. پەیوەندی لەگەل سوپای تورك هەبوو. بە بیانووی ئەوەی چاوەروانی وەلامی بەم زوانەی سمکۆ دەکات. خۆی لە هاوکاری کردنی شۆرش دزییەوە. هەر لەو کاتـەشـدا شۆرشی شێـخ سەعید شکستی خوارد. دوای شکستەکە کۆمەلێك لە جەنگاوەرەکانی خێلی جبران وزرکنان و هەسنان بە فەرماندەیەتی شێخ مەهدی برای شێخ سەعیـدو. عالی رەزای کوری شێـخ سەعیـد بەرەو سنـوری ئیران رۆیشتن. لەکـاتی رۆیشتنیان بە خاکی حەیدەران دا تێپەرین. حسێن پاشا بو ماوەی (٧) رۆژ رێگای لێگرتن. پاشان دوای شەرێکی سەخت لە نێوان جەنگاوەرە کوردەکان لەلایەك و هێزەکانی حسێن

پاشای هاوکاری هێزەکانی تورك لەلایەکی ترەوە. کوردەکان توانیان لە سنور بپەڕنەوە بۆ ئێران.

حکـومـەتی ئێران هەوڵیدا شۆڕشگێرە کوردەکان چەك بکات. بەڵام کوردەکان توانیان خۆیان بگەیەننە سمکۆ فەرزەندە بەگ و سەرۆك خێلی زرکی کەروم بەگ کوژران. (پێم وایە نووسـەر لە دوا پەرەگـرافی بە هەڵەدا چووە. ئاشکـرایـە کە فەرزەندە بەگ نەك هەر لە راپـەریـنـەکەی شێخ سەعید نەکوژرا ـنووسەر لێرە باسی ئەو راپەرینە دەکات ـ بەڵکو لە راپەرینەکەی ئیحسان نوریش نەکوژرا. بەڵکو لە دوایین رۆژەکانی راپەرینەکە بریندار بوو. دوای کشـانـەوە بۆ ئێران لەگەڵ ئیحسان نوری. هەربەو برینەوە مرد ـ وەرگێری عەرەبی ـ).

هەندێ کوری ئازای خاوەن هەستی نیشتمانی لە خێلی حەیدەران. سەرباری شەری نێوان خێلەکەیانلەگەڵ جەنگاوەرە کوردەکان. یارمەتی کوردە شۆڕشگێرەکانیاندا. ئەو کارەی کە لە هەمـوو کارەکـانی تر بووە هۆی شکـانـدن و ناوزراندنی خێلی حەیدەران. کوشتنی دوو کەس بوو لە خێلی هەسنان. کەناویان تاهیر و بەشیر بوو. لە گوندی کەنداڵ بەش کوشتنیانن. هەروەها تەسلیم کردنی حەسەن زوبێر و شمس الدین لە وەند بەسوپای تورك. ئەو دووانە رێگایان وون کرد. چوونە ماڵی بەدری بەگ. ئەمیش بەنهێنی ئاگاداری هێـزی سوپـای ناوچـەکەی کرد کە أ.بوگا فەرماندەیان بوو. حکومەتیش بە پەلە چەند ژەندرمەیەکی ناردو. هەردووکیان لە شیرین خەوا لەماڵی بەدری بەگ گرت. هەردووکیان لە رێگای بەدلیس ـ خەرزان بەرەو ئەزمیر برد. لە رێگادا هێندەیان تێهەڵدان کەبوو بە هۆی مردنی حەسەن زوبێر. بەڵام شمس الدین گەیەنرایە شاری ئەزمیر. دوای ئەوەی سێ ساڵ لە زیندان بوو. توانی رابکات و بە هەزار ناری عەلی خۆی بگەیەنێتە هێزی فەرزەندە بەگ هەسـەنی. زۆر قارەمانانە بەردەوامی بە خەباتی رزگاریخوازی نیشتمانی خۆیدا.

دوای ئەوەی قارەمـانـەکـانی حەیدەران. ئەوانەی خوێنی سوری خۆیان بۆ ئازادی گەلەکەیان رشت. توانیان ئەو دوو پەلە شەرمەزارییەی‌نێو چاوانی خێلەکەی خۆیان بسرنەوە.

حسێن پاشا بەشداری شۆڕشی کوردی نەکرد. هەر تەنیا خێلی حەیدەران دوور نەبوو لە شۆڕش.

بەڵکو هەندێ خێلی گەورەتری وەکو زیلان .سیپکان جەلالی و چەند خێلێکی بچووکی تریش دوور لەشۆڕش بوون بەشدارییان نەکرد.

بەپێی بیرو بۆ چوونی تورك هەموو کورد چ ئەوانەی دوژمنی دەوڵەت یان موالین هەموویان وەکو یەکن. چونکە کورد بوون تاوانە.

هەر لەم روانگەیەشەوە بەهۆی ئەوەی حسێن پاشا کورد بوو. وخوێنی کورد لەدەمارەکانی

دابوو. بۆیە وەکو باقی کورد معاملەیکراو ئەویش لەسزای تورك رزگاری نەبوو ئەو هەموو خزمەت ومواڵی بوونەی دادی نەدا.

بەڵام هێشتا کاتی لەبار نەهاتبوو بۆ سزادانی دوای ئەوەی راپەرینەکەی شێخ سەعید دامرکایەوە. دەوڵەتی تورك لەچلەی زستان حسێن پاشاو تەواوی خێزان وژن و منداڵەکانی گرت. لەرۆژێکی بەفروسەهۆلبەندان و، بەزەبری نوکەرەی جەندرمەرمەوانەی رۆژئاوای ئەنادۆلیان کردن، زور دووریان خستنەوە لەزاکەو نیشتمانی خۆیان.

حاجی موسی بەگ بەزرنگیو ولێهاتوویی خۆی لە سزای دادگاو زیندان دەرباز بکات. لەوێ لە دوور خراومیی لەئایدن حسێن پاشای دۆستە دێرینەکەی دێت. هەردووکیان گەلێ بێزارو نارەحەت بوون کەبەو جۆرە یەکتریان دیت چونکە ئەوان پێشتر وەکو سوڵتان لەنێو دەست ودابەرەو خێڵ ونۆکەرەکانی خۆیان دا دەژیان. هەردووکیان زووخاوی دەروونیان بۆ یەکتر هەلرشت و باسیان لەراکردن کرد.

حسێن پاشا ئاڵتون ودارایيەکی زۆری هەبووتوانی ئەسپ وچەکی پێویست بۆ هەموو کۆمەڵەکەی خۆی ئەوانەی کەدەتوانن چەك هەڵگرن بکرێت. ژن ومناڵەکانیان بەسەر دوو کوری خۆی بەجێ هێشت. لەتاریکی شەوا لەگەڵ حاجی موسی بەگ و هەندێ لەکورو کورەزاکانی رووەوسوریا رایان کرد. لەوێ لە سوریا بوونە میوانی حاجو ئاغا. کەیەکێ لەسەرکردە مەزنە نیشتمانپەروەرەکانی خێڵی هەفرکی بوو. هەموویان گفتووگۆیان لەسەر لێژنەی خۆیبون کرد.

میوانەکان ئامادەیی کارکردنی خۆیان لەو لیژنەیە دەربری. داواکاریو بەڵێن نامەیەکیان نووسیو. لەرێگای پوستی رێکخستن بۆ لیژنەی مەرکەزی خۆیبونیان نارد.

دواکاریەکەم بەدەست گەیشت. وەڵامم دانەوە کەبیان نیرتە ئاگری. ئەوانیش لەرێگای عێراق ـ ئێرانەوە هاتن ئینگلیزەکان لەشاری موسل رێگایان پێگرتن و گەراندیاننەوە سوریا. حاجی موسی بەگ نەخۆش کەوت وکەوتە سەر جێگا. پاش چەند رۆژێکی کەم مرد. کەس وکارەکانی خۆی وەزعێکی جەنجال بەجێ هێشت بەمەبەستی جێ بەجێکردنی فەرمان وئامۆژگاریەکانی خۆیبون. چوار کوری حسێن پاشاو برازایەکی لە کوردستانیتورکیاو رووەو ئاگری بەرێ کەوتن حسێن پاشاو (ئادو)ی کوری و خوشکەزاو برازایەکیشی لە کوردستانی عێراق رووەو ئاگری بەرێ کەوتن. هەروەکو پێشتر باسمان کرد دەستەی یەکەم لەئەشکەوتێکا لەلایەن تورکەکان پەلاماردان وسێیانیان لێ کوژراوەمەوو نادر بەگیش دەربازبوون وگەیشتنە ئاگری.

## کوژرانی کۆر حوسین پاشا

لەئەنجامی پەیمان شکێنیو خیانەت وئەوناپیاوەتیەی کوێر حسێن پاشا بەرامبەر راپەرینی کورد کردبووی. شەوێك لەگەڵ هەموو هاورێیانی خۆی کەوتنە بەردەست

ریـژی گوللەی کوردێکی خائینتر لە خۆیو کوژران. بەم جۆرە سەرۆکایەتی خێلو ئەو هەموو سامان وموڵکەی لە پێناویاندا خیانەتی لە گەلەکەی خۆی کرد. لە کاتی لێقەومان و مردنیا بەفریای نەکەوتن و دادیان نەدا خۆی و ئەوانەی لەگەڵ بوون. دوای مردنیان بێ کفن و دفن مانـەوەو کەسێـك نەبوو بیان شاریتەوە لە کاتێکا کە خاوەنی سەد هەزار لیرەی ئالتـونی عوسمـانی بوو. لەو هەزاران خێـزانەی حیدەری کەسێك هێندەی ئەو سامانی نەبـوو. تەنانەت ئەو دوو کەسەی لەگەلیشی بوون بە ئاگری ئەوەوە سووتان! کەسێك نەبوو ئەرکی شاردنەوەو ناشتنیان بگرێتەوە ئەستۆ. بەم جۆرە حسین پاشا بەو شێوەیە مردو سزای تاوانـەکـانی دەستـەکـانی خۆی وەرگـرت ئەگـەر چی خۆیـبـوون چاوی لەتاوانەکانی پۆشیبوو بەڵام سزای رەوای خۆی لە دادگای خوا وەرگرت! بکوژەکەشی پەلەپیـەکی شەرمەزاری بەنێو چاوانیەوە لکا، بەهۆی ئەنجام دانی ئەوکارە ناشیرینەی.
کوڕێ حسین پاشا لە سوریا بەرێ کەوتبوو. لە نێو خێڵی کوردانەوە دەرباز ببوو. و گەیشتە باکوری عیراق و. بوو بە میوانی شێخ احمد بارزانی برا گەورەی ژەنەراڵ بارزانی قارەمانی کورد. هەر لەو کاتە دا (مدنی) کوری حاجی موسی بەگ و نوە بەگی (NUHBEG) مامی میوانی شێخ احمد بوون. پاش چەند رۆژێك پشوودان و مانەوە لای شێخ. ئیجازەیان وەرگرت و بەراحەتی بەرێ کەوتن. لەو کاتەدا نوە بەگ دەڵێ: (مەدەنی برازام زۆر حەز دەکات بچێتە ئاگری. ئەویش لەگەڵ خۆتاببە) حسین پاشا بە خۆشحالیەوە رەزامەندی خۆی دەردەبرێ. مدنی هەندێ سواری لەگەڵ خۆی برد. و بەنهێنی سنـوری عیراقیـان برێ. شەو لە چیـامـانـەوە. مدنی و دەست و پێـوەنـدەکـانی پیلانێکی زۆر سوك و ترسنۆکانەیان ئەنجام دا حسین پاشاو هەردوو کەسەکەی کەلەگەڵی بوون. لە خەوا کوشتیانن و خۆیان تەسلیم بە دەوڵەتی تورکیا کردەوە. دوای لێکۆڵینەوەی پێویست دەربارەی زروف چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ئەو تاوانە. بۆ شێخ احمد بارزانی دەرکەوت کە (نوە بەگ)ی برای حاجی موسی بەگ دەستی لەو پیلانەدا هەیە بەنهێنی لەگەڵ فەرماندەرانی ترک رێکەوتبوو بۆ ئەنجام دانی ئەوکارە ترسنۆکانەیە تورکەکان بەڵێنیان پێ دابوو لەبری کوشتنی حسین پاشا دەوڵەت بریاری لێبوردنی بۆ دەربکات. بەم جۆرە حسین پاشا کوژرا. دوای ئەوەی شێخ احمد دادگای(نوە بەگ) یکرد. هەموو وردەکاری رووداوەکەی زانی. لە پەیوەندی نهێنی نوە بەگ و تورك ئاگادار بوو بریاری گولله باران کردنی نوە بەگی داو نەیهێشت چێژ لەو بریاری لێبوردنەی وەربگرێت. لە کۆتای هاوینی ساڵی ١٩٢٩ دا لەنزیك ئاگری. ناکۆکیەك لەنێوان هێزە سوریـەکـانی ئیرانو تورك رووی‌دا. چەکدارەکانی(رشید) کەسەر بەئیران بوون. پەلاماری بـەندێکی سنوری تورکیان داو یەکی لە سەنگەرەکانیان گرت. کوردە شۆرشگێرەکان بەپەلە ێن بۆ پشتیوانی ئێرانیەکان. ئەفسەرە تورکەکە ترسا لەوەی رووداوەکە گەورە تربێت. بۆیە بەپەلە رتە گفت و گۆ لەگـەڵ ئەفسـەرە ئێرانیـەکـە هەردووە رێکـەوتن لەسەر چارەسەرکردنی وکیەکە. من ئەو کاتە لە ئاگری نەبووم، بەڵکو چووبووم بۆسەردانی ـەکانی لێژنەی خۆیبون لەناوچەی ئاباخ لەویلایەتی وان. هەر لەو کاتەشدا شێخ عبدالقادر

لەپاوانەکانی ئالاداغ دەگەڕایەوە. لەڕێگادا. لەبناری چیای تەندوورەك ڕووبەڕووی هێرشی هێزەکانی تورك بوو. دەستەو دایەرەکەی شێخ ناچار بوون بەشێکی زۆری ئاژەڵ و سامان و سەروەتی ئاژەڵی جێ بهێڵن **بەپەلە** پرۆزی رابکەن و خۆیان بگەیەننە ئاگری. بە جۆرێکی ئەوتۆ لێیان قەومابوو مرۆڤ گریانی بۆ دەهاتن. هەر هێندەیان بۆ کرابوو خێزان و منداڵەکانیان دەربازبکەن. لەوهێرشەدا شێخ صاڵحی برازاو شێخ یاسینی ئاموزای شێخ عبدالقادر لەگەڵ هەندێ پیاوو ئافرەت کوژران. بەم جۆرەو. ڕێك لە ئەنجامی ئەو کارەدا. شێخ عبدالقادر هاتەوە ڕیزی شۆڕشگێرەکان.

# ڕووداوێکی ترسناك

**لەکاتی گەڕانەوەم دا. میوانی ماڵی یوسف ئاغا بووم. (یاشار خانمی) هاوسەرم کەبە پەساپۆرت لە تورکیاوە چووبووە سوریا. لەوێوە چووبووە تەبریز یەکێکم نارد بەدوایدا بیهێنێتەوە. بەڵام لەوکارە تووشی ڕووداوێکی قورس و ترسناك بووم. پوستە چیەکەم لەشاری خۆی Xoy بوو. نامەیەکم بۆ ڕەوانە کردو ئەدرێسی خانمم پێدا، تابچێ بیهێنێ. دە ڕۆژی پێ‌چوو هیچ هەواڵ و وەڵامێك نەبوو. منیش کوردێکم لەگەڵ خۆم برد بەناوی (سلۆ) کە خزمەتکاری دیوەخانی یوسف عەبدال ئاغا بوو، هەندی جلی کۆن و شڕی کوردیم پۆشی‌و تفەنگەکەم بەشانم دا داو. بەپێ‌کەوتمەڕێ‌و چوومە شاری خۆی. لەوێ بووم بە میوانی پیاوێکی هەژاری ناسیاوی (سلۆ). کەشەو داهات چوومە ماڵی پوستەچی خۆم ولێم پرسی: بۆ نەچوویت ؟!! گوتی: ( ئەو زەرفە کەڕەوانەت کردبوو. مۆرێکی دەوڵەتی لەسەربوو. نەمزانی چی‌لێ بکەم. بۆیە نەچووم). لەڕاستی‌دا من زەرفی نامەکەم بەمۆری خۆیبوون مۆرکردبوو. کابراش وای زانی بوو مۆری حکومەتە دڵنیام کردو پێم ووت: ناونیشانی تایبەتی هێنانی خێزانەکەم لە پشتی زەرفەکە نووسراوە. تۆ تەسلیمی ئەو کەسە بکە. کە ناوی لەسەر نوسراوە. کابرارۆیشت. چەند ڕۆژێك چاوەڕوانم کرد بەڵام نەگەڕایەوە. یەکێ لە ڕۆژەکان بۆبێ تاقەتی چوومە دەرەوە. کڵاوێکی پەهلەویم لەسەر کردبوو. لە کۆڵانێك دەڕۆیشتم. چاوم لێ بوو چەند جەندرمەیێك لەبەردەم ماڵێك وەستا بوون و لە نێو خۆیان قسەیان‌دەکرد. منیش بەبەردەمیاندا تێ‌پەڕیم. گوێم لێ‌بوو یەکێکیان بانگی کردم: ئەفەندی. ئەفەندی‌یەکسەر زانیم مەبەستی منە. بەڵام من خۆم لێ گێل کرد. یەکێکیان بەراکردن دوام کەوت و. لەپشتەوە دەستی خستە سەرشانم و ووتی: بانگم کردی بۆچی نەوەستای ؟ وەڵامیم دایەوە: تۆ بانگت دەکرد ( ئەفەندی ئەفەندی) مەبەستت کام ئەفەندیە... هەر چۆنێکیش بێ من ئەفەندی نیم. ووتی: وەرە بردمیە لای فەرماندەکەی‌و پێی ووت: ئەمە راکردووی سوپای تورکە ... گرتم. هێنام بۆلای تۆ ئەفسەرەکە هیچ**

قسەیەکی لەگەڵ دا نەکردم. شتێکی نووسیو دایە دەست جەندرمەکەو پێی ووت: ئەم پیاوە ببەو تەسلیمی پۆلیسی عەسکەری بکە رۆیشتین. ڕێگاکەمان بە ناو بازاردا تێدەپەری جەندرمەکە لە بەردەم دوکانێك وەستاو ووتی: جگەرە دا دەگیرسێنم. چوینە دوکانەکە: من دوکانەکەم ناسی. چەند ساڵێك پێشتر لەگەڵ ڕاسم و تۆفیق بەناوی خواسترا و (مستعار) لە سنووری عیراق پەڕینەوەو هاتینە ئێران. وەرزی زستانمان لە خۆی بەسەر برد. دوکاندارەکەش منی ناسیەوەو یەکسەر ووتی: حاجی بەخێر هاتنی ئەی برا دەرەکانت لە کوێن؟ پێم ووت: مەبەستت کام حاجی‌یە. دەربارەی کام برادەر دەدوێی؟ ووتی: من زۆر باش دەتناسم. ئێوە سێ کەس بوون دەهاتنە دوکانەکەی من. نکوڵیم کرد. ئەویش ووتی: چ سودێکی بۆ من هەیە ئەگەر ئەو|بێت‌یان ئەو نەبیت. لە دوکانەکە دەرچوین و جەندرمەکە پێی ووتم: بینیت درۆت لەگەڵ من دەکرد ڕاستم پێ بڵێ تۆ کێی؟ وەڵامم دایەوە: ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە من کوردی کوڕی کوردم!. ئەو جەندرمەیە چەند ساڵێك پێش لە ناوچەی ئاباخ خزمەتی سەربازی کردبوو. هەموو سەرۆکی ئاباخی‌یەکانی دەناسی. یەك یەکی لێ پرسیم. بەڵام من ئاشنایەتیەکم لە گەڵیاندا نەبوو و نەم دەناسین. هەستم کرد خەریکە لەگەڵی دەکەومە قسە. ئەمەش لە بەرژەوەندی من نەبوو. پێم ووت: من ناچار نیم وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە. تۆ دەم بەی تەسلیمی پۆلیسی عەسکەریم دەکەی لەوێ هەر چی دەبێ بابێ. لە دڵی خۆم دەم ووت: من خەڵکم بەدوای یا شاردا ناردووە ئەمانیش گرتویانم. بەڵام نام ناسن.

ئەگەر بڵێم من ئیحسان نوریم ئەوا پێم بروا ناکەن تەسلیمی تورکیام دەکەنەوە. دوکاندارەکەش ئەوەی ووتی: هەڵوێستم زۆر لاواز بوو. تۆ بڵێی وەزعی مناڵ و دایکەکەی چیان بەسەر بێت؟ زۆر بێ ئومێد بووم. قسەم لەگەڵ خۆم دەکرد و شنەبای گومانیش باری بە فکرم کرد. گەیشتینە دائیرەی پۆلیسی عەسکەری. بەبیرم هاتەوە. پیاوێکی ئاینی (مەلا) هەبوو لە ئاگری. لە دەوروبەری (وان) هاتبووە ئەمە ناوچەیە پیاوێکی دوعا خوێن و خوایی بوو. دوعایەکی فێر کردبووم و کە مرۆڤ بە خوێندنی هەستی بە دڵنیایی و بروا دەکرد. جارێکیان بێی ووتم: کاتێ دەچیتە لای مەسئولێکی گەورە. بە نهێنی ئەم دوعایە بخوێنە ئەوسا برۆ بۆ لای و هیچیش گوێی مەدەرێ. ئەو مەسئولە دەکەوێتە ژێر تەئسیری تۆ. منیش دوعایەکەم خوێندو چوومە ژوورەوە. جەندرمەکە وەرەقەکەی دایە یەکێکیان. کابراش پێی ووت: برۆ دەرەوە: ئەویش چووە دەرەوەو هیچ قسەیەکی نەکرد. ئەوساش من هەستم بە هەندێ دڵنیایی کرد مەسئولەکە لێی پرسیم: تۆ کێی؟ وەڵامم دایەوە: من خزمەتکاری یوسف عەبدال ئاغام، ووتی ناوت چیە؟ ووتم: وەزۆ! ووتی: بۆ چی هاتوی بۆ خۆی؟ ووتم: سەعاتە زیوەکەی ئاغام شکاوە لەگەڵ خۆم هێناومە بۆ چاکردنەوەی لای سەعاتچی. ووتی: دە هەر ئێستا برۆ سەعاتەکە وەربگرەوەو یەکسەر

بڕووەنەر شوێنەی لێی هاتووی!بڕوام نەدەکرد. شادی‌یەکی زۆر خۆش دایگرتم. خوایە ئەمجارەش ڕزگارت کردم. دوای ئەوە لە هوتیل دانیشتم و هەرگیز نەچووومە دەرەوە. ڕۆژێك (سلۆ) بە پەلە هات بۆ لام و ووتی: برا دەرێکی یوسف عەبدال ئاغام دیومو ووتی: دائرەی پۆلیسی بیستویانە پیاوێك لە هوتیلەو هەرگیز نایەتە دەرەوە. نیازیان وایە بچن بیگرن و تەحقیقی لەگـەڵ بکـەن. بۆیـە ئەبێ بە پەلە بڕۆی و لە شار بیبەیتە دەرەوە! ئەو کاتە بەپەلەو لە تاریکی شەودا لە شار چوینە دەرەوە. سلو دەیویست هەندێ گەنم بکرێت. بۆ بردنەوەی ئەو گەنمەش گایەکی لەگەڵ خۆی هێنا بوو. لە ڕێگا هەندێ گەنمی کڕی. لە خۆی هەندێ توتنی کڕی بوو. و لەناو گەنمەکە شاردیەوە. لە دەشتی خۆی بە کەندیکی زۆر بێ ئاوو کەم بەرزایـی‌دا ڕۆیـشـتـن. لە هەمـان ڕۆژدا گەیشتینـەوە خاکی کورد. لەرێگـامـانـدا بە مەلبـەندیکی سنوری‌دا تێ‌پەڕین. مەئموری گومرگ کە جەندرمەیەکی چەکداری‌لەگەڵ دابوو. ڕێی پێ‌گرتین. شەو باڵی خۆی بەسەر هەموو ناوچەکەدا کێشا بوو لە دڵی خۆمـا ووتم. ئەگـەر گەنمـەکە سەیر بکەن. ئەوا بەبێ گومان توتنەکە دەدۆزنەوە ئەوسـاش بە تومـەتی توتن بردن دەمان گرن. ئەگەر چی تەئکیدمان لە سەرئەوە کردەوە کەلەگەنم زیاترمان پێ‌نیە بەلام مەئموری گومرگەکەبروای پێ‌نەکردین. منیش سەبرم نەما. زانیم هەر چەند قسەی بۆ بکەین ناتوانین ڕازی بکەین. بۆیە تفەنگەکەم لەشا نم هێنایە خوارەوەو ڕووم تێکـردو ووتم: هەرگیـز بیرلەوەنەکەنەوە خۆمان تەسلیمی ئێوە بکەین. مەئمـورەکـە وەلامی‌دامـەوە: بڕوام پێ بکـە دەزانم کە هیچیتان پێ نیە. بەلام دەستور دەستورە. ئەرکمانە کە بەم شێوەیە لێتان بپرسین. فەرمون بەرێگای خۆتان دا بڕۆن! بەم جۆرە ئەو جارەش ڕزگارم بوو!. بۆ ڕۆژی دواتر گەیشتینە ماڵی یوسف عەبدال ئاغا. زۆر هیلاك بووم و هێزم لە بەردا نەمابوو. هەندێ سەرمام خواردبوو نەخۆش کەوتم و ڕاکـشام. پاش چەند ڕۆژێك کەسێکی ترم نارده خۆی. یا شار خانم گەیشتبووە ئەوێندەرێ. داوام کرد ووڵاخێکی بۆ بنێرن.ووڵاخەکەم بۆ ناردو پێی هات بۆ ئاگری. گەیشتنی یاشار خانم بۆئاگری شتێکی وانەبو بەلام تواناو ئیمکانیاتی ڕێکخستنەکانی خۆیبون دەردەخات.

هێشتـا هەفتـەیـەك بەسـەر گەیشتنی ئەو داتێ‌نەپەڕی بوو کە فرۆکەکانی تورك بەری ئاسمـانی ئاگـری یان گرت. بەتـوپ و مەترەلۆز بۆردومانی ناوچەکەیان دەکردو ئاگرو قورقوشمیان دەباراند هەر وەکو بڵێی خۆنیشاندانێکی عەسکەریان بۆ بەخێر هێنانی یاشار خانم دەکرد!

تەمـرشـەمکی جارێکی تریش گەرایـەوە ئاگـری. ئەمجـارە لەگەڵ هاتنی خۆی‌دا جیا لە چەرکـوی برای. هەردوو براکـەی تری (ئـوسی) و (فەتۆ) شی هێنابوو کە لە ئازایەتی‌و شەرکردندا بە ڕاستی بە حەفتان بوون. جەنگاوەرێکی دیکەی کورد بەناوی شێخ زاهیر لەگـەڵ برای خۆی هاتنە گوندی شێخ عبدالقادر و پەیوەندیان بەرێزی تێکۆشەران کرد.

لەئاگری. دەستم بە دەرکردنی رۆژنامەیەك کردبوو بەزمانی کوردی بەناوی (ئاگری). بەڵام کاغەزی پێویستی تەواومان نەبوو.

بۆیە بەژمارەیەکی زۆرکەم بڵاومان دەکردەوە. لە بەر ئەوەی ئێمە چاپخانەمان نەبوو. بۆیە ناچار بووم هەندێکی بە دەست نووس بنوسینەوە بەشەکەی تریش لەسەر جەلاتین دەمان نووسی گەرمەمان دەکردو پاشان ساردمان دەکردەوە. لەئاگری ئامادەمان دەکرد. تورك تێگەیشتن کە لەگەڵ نەیارێکی زۆر نەترس. سەروکاریان هەیە زۆر دەترسان. هەر بۆیەش لەترسی پەلامارو هێرشی کوردان لە تاریکە شەو دەستیان بە گوللە باران وتۆپ هاوێشتن دەکرد کە لەسەنگەرێك دەنگی تەقە بەرز دەبووەوە. سەنگەرەکانی دیکەش دەستیان بە گوللە هاوێشتن دەکرد. ئەم کارانە لەبەر چاوی ئاگرییەکان وەکو یاری ئاگر (ئاگر بازی) بوو. لەزستانی ئەو ساڵەدا دەستەیەك لەجەنگاوەرەکان بە فەرماندەیەتی رەسولی کوری شێخ عبدالقادر چوونە سەر گوندی محمد هەسوور، کە چەند کیلومەتریك لە شاری بایەزید دوور بوو. لەوێ محەمەد هەسەسووریان کوشت. ئەو پیاوە بەوە ناسرابوو کەپەیوەندی بە حکومەتی تورکەوە هەبوو بەپێی نەخشەو لەسەر داوا کاری ئەوان. خۆیو چەکدارەکانی دەچوونە ناو خاکی ئێران. لەوێ پەلاماری خەڵکیان دەدا. ماڵیان تاڵان دەکردن. لەکاتی گەرانەوەشیان دا بەشی لێ پرسراوی ناوچەکەی تورکیا دەدا. پاشانیش ئەو تاوانە سوك وچروکەیان دەخستە ئەستۆی کوردە شۆرشگێرەکان. شێخ محمد لە خێلی بەرو هەسکی و ئاموزای خێزانی شێخ عبدالقادر بوو. پێش ئەنجام دانی ئەو کارە حیزبی خویبون بریارێکی دەرکردبوو بەپێی ئەو بریارە ئەبوو کوردە نیشتمان پەروەرەکان سوود لەپشتیوانی سیاسیو مەعنەویو ئابوری.

دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران وەربگرن. ئەو بریارە لە لیژنەی مەرکەزی حزبی خۆبیون دەرچوو بوو. دووریش نیە فەرماندەی عەسکەرییەکانی ئێران ئاگاداری ئەو بریارە بن پێش دەرکردنی ئەو بریارەش ئاگرییەکان هەمان سیاسەتیان پیادەکردبوو رۆژێك لە رۆژان نەبوو ئاگرییەکان. هەر لە سەرەتای راپەرینەکەیان تا دەرکردنی ئەو بریارە. دواتریش کارێکی ئەوتویان بە پێچەوانەی ئەو بریارە ئەنجام دابێت. هێزە شۆرشگێرەکانی ئاگری. کە بەرهەڵستی دەولەتی تورکیان دەکرد کە مانەوەی ناوچە سەر سنورییەکانی ئێران. بەناوچەی بێ لایەن سودی زۆری هەیە. هیوایان بەوەش بوو کە ئێرانیش ئەوەی پێ خۆش بێت هێزەکانی ئاگری پاداشت لە ئێران وەربگرن. زستانی ١٩٢٩ تەواو بوو. چوار ساڵی تەواو بوو کە (ئاگری)یان سەربەخۆ لە ژێر ئاڵای سەربەخۆیی کوردستاندا بەهێزێکی زۆرکەم لەگەڵ دەولەتی تورك شەریان دەکرد.

بەهاری ساڵی ١٩٣٠ هات. هێشتا سەرمای ئاگری دەوروبەری لوول دەدا. گوندەکەی شێخ

عبدالقادر لەلایەن هێزە حکومیەکانی تورك و کۆمەڵێك بەکرێگیراوی خێڵی کەسکویی. بە فەرماندەیتی فەرماندەی تیپی سوارە (میر ئالای فەرهاد بەگ). ئابلوقە درا. گوندەکەی شێخ عبدالقادر کەوتبووە بناری رۆژئاوای چیای ئاگری لە ناوچەیەکی دەشتایی تەخت بوو. لەلای باکورو رۆژئاواشیەوەیە بەرزاییەکی شاخاوی زۆر بلند وداچەقیوی وەکو دیوار دەورە درابوو. دوژمن شەو هاتبــوو و بەرزاییەکەی گرتبووە

بەیانی زوو. لەکاتی چوونە دەرەوەی شێخ بۆ دەست

نوێژ هەڵگرتن. درایە بەر شیلکی گوالە. گوندییەکان لە دەنگی تفەنگەکان وەئاگا هاتن. گوللەی تفەنگ و مەترلۆز وەکو تەیرۆکە بەسەر گوندەکەدا دەباری کات کاتی بیرکردنەوەو راوێــژ کردن نەبــوو. مانەوە لە چاوەڕوانیکردنی گەیشتنی یارمەتی بۆیان زۆر گران لە سەریان دەکەوت. هەروەکو دەزانن کورد لە هەڵوێستی پاراستنی گیانی خۆیان سەبریان نیــە. بۆیــە تەمــر شەمکیو. ئوسی فەتۆ چەرکو. شێخ زاهیر. شێخ رەسولی کورد شێخ عبــدالقــادر. ئامــۆزاکانیو عەلۆی ئیزدی و چەند پیاوێکی دیکەی شێخ هەر بەکراسو دەرپێ. دەرفــەتی جل وبەرگ لە بەرکردنیان نەبوو. بە دەستێك تفەنگ و بە دەستەکەی تریش فیشــەکــدانیــان هەڵگــرت و هاتنە دەرەوە.لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا دووەمین جاربــوو کە رۆڵە ئازاکانی ئاگری ئەو قارەمانیەتیە بنوێنن بەمەش قارەمانێتی باپیرانی پێشوی خۆیان دەهێنایەوە یاد قارەمانەکان وەکو بەرانە کێوی لەسەر شاخەکان بازیان دەدا. پەلاماری دوژمنیان دەدا. دوژمن سەرسام و حەپەساو بوو لەبەر هەڵستی بێوێنەی ئاگــرییــەکان بۆیە ئەفسەرو سەربازەکانی خەتی پێشەوەی شەرەکە وورەیان رووخاو کوژران. دوژمن تەواو شکستی خوارد. هێزەکانی بەپەرت و بڵاوی و بە هاوار هاوارەوە رایــان کرد. کاتێ لەگــەڵ برۆو هەندێ پێشمەرگە گەیشتینە مەیدانی شەرەکە. تورکەکان بڵاوەیان کردبوو. هەندێکیان گەیشتبوونە شوێنی یەکەمی خۆیان. بەشێکی تریان سەر لێ شێواو بوون. هەریەکەو بە لایەکدا رای دەکرد.هەندێکیان ـ بۆ دەربازکردنی گیانی خۆیان ـ رایان کردبووە سەر بەرزاییەکی نزیك شوێنی یەکەمین جار کوردەکان ٢٠ سەربازیان گرت.

شێخ زاهیرو ئوسی رێگایان لە بەردەم عەسکەرەکان بری بوو. کە دەیانویست رابکەن و هەمــوو چەك و تفــاقــی جەنــگیش لە دوای خۆیــان جێ بهێڵن. کە کەوتــە دەست شورشگــێرەکان هەروەها شورشگێرەکان چەند رەشاشێکی مەترلۆزی بچوکیان گرت. لە

بەردەمی ماڵی شێخ. لەگەڵ برووشێخ دانیشتم باسی چۆنیەتی شەرەکەمان دەکرد. کوردێك کە پەیوەندی بە حکومەتەوە هەبوو لە ئاگرییەوە هات.

جلەوی ئێستریکی لەدەست بوو و لەشێخ نزیک بوومەوە دووجەنازە بەسەر پشتی هێسترەکەیەوە بوو. یەکێکیان لاشەی ئەفسەرێکی تورک و. ئەویتر لاشەی کوردێک بوو سەرئنجامدا لاشەی کوردەکە ناسیمان کە تەمرکەسکوییە. کە پێشتر ووتبووی: (من تورکی کوری تورکم) ئەو کاتە برو هەسکی وەلامی دایەوەو پێی ووت: هیوادارم رۆژێک

دابێت لەگەڵ برایەکی تورکت لەیەک جێ بنێژن کاتی برو هەردوو لاشەکەی ناسی ووتی

تەنانەت خوداش سەبری نەماوە. پەلە دەکات لەسزا دانی خائینەکان ئێمەش لە سەر ئەو ئەساسە بریارمان دا هەردوو لاشەکە لەناو یەک گۆر بنێژین. تەمر کەسکویی لەبری ئەوەی شانازیو سەروەری بۆ ژن و منالەکانی جێ بهێڵێ سەر شۆڕیو شەرمەزاری بۆ بەجێ هێشتن. شۆڕشگێڕەکانی ئاگری داوای مافی رەوای گەلەکەیان دەکرد لە ئازادیو سەربەخۆییدا خوێنی خۆیان لەو رێگایەدا دەرشت. بەلام تەمر کەسکویی کە ئەویش هەر

کورد بوو. بە پێچەوانەی ئەوە رەفتاری دەکرد. دوورنیە ئەویش لە ئەنجامی شەرا ئازاو جەسور بووبێ. بەلام نەزانیو گەمژەیی راستیەکانی لەبەرچاو وون کردبوون. خلیسکایە زەلکاوی خیانەت. چووە پاڵ دوژمن و شەری رۆلەکانی کوردی نەتەوەی خۆی کرد.

دیلە تورکەکانیان رەوانەی مەلبەندی سەرکردایەتی کورد کرد. رۆژی دوانر کومەلێک چەکداری کورد دیلەکانیان بردە مەلبەندی سنووری ئێران. لەوێ تەسلیمی یاساوولە ئێرانیەکانیان کردن تا ئەوانیش بیانگەرێننەوە تورکیا. لە کاتی رۆیشتنی دیلەکان. ئافرەتێکی هەژاری کورد کەناوی هورک بوو بینی گورەوی یەکی لەدیلەکان دراوە گورەوی یەکانی قاچی خۆی داکەند و دای بەدیلەکە. بۆ ئەوەی قاچی لەسەرماو ەهولبەندان بپارێزێ. کوردەکان بەو جۆرە رفایەتیو پیاوەتیەوە هەلسو کەوتیان لەگەل

دیلە تورکەکان دەکرد. بەلام تورکەکان رێک بەپێچەوانە بوون. هیچ سلیان لە کورد کوشتن نەدەکرد. پیاوبایان ئافرەت. ئەگەربیان زانیایە پەیوەندی بە شۆڕشی ئاگرییەوە هەیە، سالی ١٩٣٠ پێنجەمین بیرەوەری هەلگیرساندنی شۆڕشی ئاگری تێپەری کوردەکان زیاتر هوشیار بوونەوە لە پێویستی سوور بوون لەسەر داواکاری مافە مێژوویی‌یەرەواکانیان. بۆیە هەموو بۆ چوونێکی حکومەتی تورکیان رەت دەکردەوە لە مەر بریارد ساختەکانی لێ بوردن و ئامازەکردن بەدا نەوەی زەرەروزیان .. هتد شۆڕشگێرەکانی ئاگری دەیان ووت :,

ئێمه پێویستمان بەڵێ بووردن نیه. بەڵکو ئەبێ ئەوان عەفو بکەین. ئێمە جیا لە داواکاری مافە رەواکانمان شتێکی ترمان نیە. حکومەتی تورکیش بە ئاگرو ئاسن وەلاممان دەداتەوە. بۆیە کاتی زانی خۆی بە تەنیا ناتوانێت بەرهەلستی کوردەکانی ئاگر سەرکوت بکات داوای پشتیوانیو یارمەتی لە دەرەوە کرد.

# هەوڵە دیبلۆماسیەکانی تورك

لەبەرئەوەی چیای ئاگری دەکەوێتە سەر سنووری تورکیا- ئێران - روسیا. بۆیە تورکیا کەشـەی بەچـالاکی سیـاسیو کۆششی دیـبلۆماسی خۆیدا. ئەگەر چی پەیوەندی نێوان تورکیاو روسیا باش بوو. بەلام لەئەنجامی دروست کردنی درۆو پروپاگەندەی ژەهراوی توانی روسیـا بەلای خۆی رابکێشێت. هەروەها لەئەنقەرە گفت و گۆ لەنێوان وەزارەتی کاروبـاری دەرەوەی تورکیـا و بالیوزی دەولەتی شاهنشا. دەربارەی مەسەلەی ئاگری بەرێـوەچـوو. ئەو گفت و گۆیـەبـوو بە هۆی گوشـەگـیرکـردنی کورد. دژی ئەوان و ئاواتەکانیان بوو. هەروەها نوێنەری تورك لە تەهران گفت و گۆی لەگەڵ ئێران کرد.
شۆرشگێرەکانی ئاگری بەووردی متابعەی رووداوەکانیان دەکرد چونکە من ئێرانم بە دۆستی کوردان دەزانی باوەرم نەدەکرد. ئێران ئەنجامێك بە زیانی ئێمە وەربگرێ. وەکو دەلێن نفی سەر هەوراز بەریشی خۆی بکـەوێتـەوە. بەلام لەو هەولانـەی بەئـاشکرا بۆ

سوودی تورك دەدرا بێ ئاگا نەبووم. ئەوان هەولیان دەدا کیش لای تورك قورستر بکەن رۆژنامەی ئاگری کەبیروبۆ چوونی ئێمەی بلاودەکردەوە. وتارێکی لە ژێر ناونیشانی ( بەبـارێـك دووچـولەکە) نووسی بوو کەتییدا هاتبوو:- دەولەتی تورکیا هەوڵ دەدات تووی ناکۆکی بخاتە نێوان ئێران و کورد ئێران لە کورد برەنجێنیو. ناکـۆکیـان لەنێـوە دروست بکات.

بۆ ئەوەی بۆ ماوەیەك لە شۆرشی کورد رزگاری بێت. دوژمنایەتی بخاتە نێوان کوردو فارسەکانی ئامۆزایان. بەمەش هەردووکیان لاواز بکات و ئاواتە چاوچنۆکیەکانی خۆی و خەوەکانی لە ئازەربایجانی ئێران بێنێتەدی

بەڵام ئێمە لەسەرکردایەتی ئاگری خۆشبەختانە زۆر لەوە ووریاتر بووین فێڵمان لێبکرێ. شتێکی ئەو نۆمان نەکرد ئەوان بۆ نەخشەکەی خۆیان سوودی لێ وەربگرن. بەیانی هەموو رۆژێك فرۆکەکانی ئاگری سارۆخەکانیان دەکردە دیاری بۆ دانیشتوانی ئاگری. جارێکیان پێش ئەوەی بچینە پاوانەکان. بەهەڤالیتی شێخ عبدالقادرو ۲۰ سوار چووینە سەردانی لقی خۆیبوون لە باکوری ئاگری. و لە دەشتی ئەخدەر جەولەمان کرد. ئەمە یەکەمین جاربوو ئاڵای ئازادی کورد لەو دەشتە بشەکیتەوە لە رێگادا تووشی هەندێ تورك بووین کە حکومەتی تورکیا لەو ناوچەیەی نیشتەجێ کرد بوون. بۆرێز گرتن لەئاڵای سەربەخۆی کورد سەری خۆیان دادەنەواند.

هێشتا هاوین لە سەرەتای دا بوو کە ئاگرییەکان چادریان لە بەرزایی چیاکان هەڵدا. هێشتا ۳ رۆژ تێنەپەری بوو کە دەنگی تەقە لە لای باکوری رۆژئاوا. لەسەر ئەو رێگایەی باکوری ئاگری بە باشوری دەبەستیەوە بەرز بووەوە. دوای ئەوە هەندێ لەفرۆکەکانی دوژمن هاتنە سەر پاوانەکان و چادرەکانیان ئاگر باران کردین چادرەکەی منیش بوو بەجێنیشانی ئاگری دوژمن. لە ئەنجام دا پاشار خاتونی خێزانم بریندار بوو. هەندێ مەرو ماڵاتیش کوژران. دوای ئەوە زانرا کە تورك لە ژێر پەردەی تاریکی شەو تابورێك سەربازو دوو تۆپی چیاییان هێناوەتە سەر رێگای قاپاقتەپە. کە دەکەوتە لای رۆژئاوای ئاگری. ئەمەش دەست پێکی هێرشێکی بەر فراوان بوو کە تورکەکانی لە ساڵی ۱۹۳۰ داکردیانە سەر ئاگری.

قاپاقتەپە وەکو قەڵایەکی سەخت و رێگایەکی تەنگی هەبوو. (زوهدی کویفن)ی ئەفسەری تورك دەنووسێ و دەڵێ: (یاخی بووەکان بە هەموو هێزێکیانەوە پاریزگاریان لەو بەرزاییە دەکرد) بەڵام لە راستیدا هیچ مرۆیەکی کورد پارێزگاری لەو بەرزاییەو دەوروبەرەکەی نەدەکرد. چونکە هێندە هێزمان نەبوو پارێزگاری ئەو شاخەو دەوروبەرەکەی پێ بکەین. فرۆکەکانی تورك بە پێچەوانەی ساڵانی پێشوو هەموو رۆژێ لەسەر ئاگرییەکان دەسورایەوەو ئاگرو قورقوشمی قونبەلەکانی خۆی بە سەر ژن و منداڵان دا دەرژاند. بەڵام زۆر بەرز بوون لە ئاگرە دژەکانی ئێمە دەترسان. لە لایەکی تریشەوە کوردەکان چونیەتی خۆشاردنەوە فێربوو بوون. بەمەش قوربانی گیانیان کەمتر دەبوویەوە. تەنیا لە مەرو ماڵات زیانیان لێ دەکەوت. یەکێتی سوڤیەت هێزێکی زۆری لە بەرامبەر سنوری ئێران و

ئاگـری کۆکـردبــووه. هەروەهــا ئیران هێزێکی زۆری لەماکۆ مۆل دابوو تورکیا کوششی سیــاسیو عەسکەری پێکەوه دەست پێکردبوو. سوپای خوی له نزیك ئاگری نیشتەجێ کردبوو. رۆژنامەی ( جمهوریت) ی تورکیا له ژمارەی رۆژی ۳۰/تەمووز/ ۱۹۳۰ لەژێر سەر دێـری (دوا گلەییمان) لەئیران نووسی: هەواڵنێری رۆژنامەی تایمز له ئەستەنبول هەواڵێکی بۆ رۆژنــامــەکــه ناردو . باس دەکـات که هەزاران یاخی بووی، کورد. کەله لوتکـەکـانی چیــای ئارارت یاخی بوون. شوێنـەکـانی خۆیــان قایم کردووه. بۆ ئەوەش کوردەکانی ئیران یارمەتیان دەدەن. ئەرکانی جەنگی تورکیا ٦٦ هەزار سەربازی دەرەکی تورکی ئامادەکرد. سەد فرۆکەی جەنگیش پشتیوانی لێ دەکردن. ئەو هێزانه یان رەوانەی ناوچەکانی وان و بایەزید کرد. تائامادەی شەرێکی سەخت و دوورو درێژ بن. رۆژنامەی (جمهوریت) له ژمارەی رۆژی ۳۰/تەمووز/۱۹٦۹ لەژێر ناونیشانی (٤٠ساڵ لەمەوبەر) جارێکی تر ئەم هەواڵەی بڵاوکـردەوه. ئەو هەزاران کوردەی که ئەرکانی جەنگی تورکیا ئاماژەی بۆ کردبوون. لەراستی له نزیکەی (٥٠٠) چەکدار زیاتر نەبوون کـه لـه چیـای ئـاگـری یـاخـی بـوون هێـزەکـانـی تـورك بێ دەسەڵات بوون له تێك شکاندنی دەســەڵاتیــان وگـرتنی بارەگـاکـانیــان له ئاگـری. ئەمــه له کاتێکـا پێـویستیـەکـانی بـەرهەلسکاریمان هێندە نەبوو. ئێمە جیا لەو تفەنگ و تفاقی جەنگییەی لەسەربازە دیل و کوژراوەکانی دوژمن دەستمان دەکەوت. سەرچاوەیەکی ترمان نەبوو. تەنانەت خۆم پێش ئەوەی لەشــەری (کـانی کورك) دەست بە سەر چەکێك دابگرم. بێ چەك بووم. کاتێ به دەمانچەیەك له چەشنی کۆن که هەندێ له دیانەکان پێشکەشیان کردبووم. هێرشم کرده سوارەکانی تورك و توانیم به دیلیان بگرم.

بەو جۆره بووم به خاوەن تفەنگ. بێگومان ئەو سەربازانەی که بەوجۆره دیلم کردن. دواتر نەیان ووت که تەنیا سوارێك دیلی کردوون. هەروەها فەرماندەی تیپه تورکەکه نەیتوانی دان بەوەدابنێ کەلەبەردەم ۱۷ سواری کورد رایان کردووەو هیچیتر، ئەوا ن
ئەو هەموو دیلەیان
زیــان لێ کەوت د دەزانی چۆن راپـۆرتێکیــان رازانـەوتەوه بۆ وەزارەتی جەنگی تورك. ئاماژەتیان بۆ هەزاران کوردی یاخی بوو کردووه! باوەرم نەکرد که ئێران کارێك له دژی ئێمه بکـات، بەڵام له وتــووێژی ئێران و تورکیاش نیگەران بووم، ئەو ساڵه ساڵی قارەمانێتی ئاگرییەکان بوو. فەرماندەی کوردویستی مەڵبەندێکی تری وەکو ئاگری لەدۆڵی زیـ و چیای سیپان دروست بکات. بزوتنەوەی ئازادیخوازی فرا وان و گەوره تر بکات. نەخشەی تورك سووکتر بکات. پاش چەند رۆژێکی کەم سەرۆکەکانی دۆڵی زیلان و خەڵکی حەیدەران له گوندی (دەرەن) کۆبونەوه. بریاری هەڵگیرساندنی راپەرینەکەیان دا. داواشیان لەمن کرد. رێـای راگەیاندنی هێرش و جەنگ بدەم! سەیرمان کرد ئاژاکانی حەیدەران ئامادەیی

تەواویان هەیە. چاوەروانی ئامازەیەکی دەست پێکردنن. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە تورکیا دەستی بە هێرشە سەرەتاییەکانی خۆی کردبوو.

## دۆڵی زیلان

دۆڵی زیلان. دوای ئاگری دووەمین ناوچە بوو کە بوو بووە کۆسپ لەبەردەم رەوتی هێزەکانی روسیا لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا. دۆڵی زیلان دوور لە دەسەڵاتی هێزەکانی روس مایەوە. دیارە ئەو کەلە سەرکێشە خۆیان بۆ جۆرەها ئیحتمالی سەخت ئامادە کردبوو. بەمەش هەمیشە پارێزگاری خۆیان و بوونی سەربەخۆی خۆیان کردووەبۆیە بە دەنگ داواکاریەکەی دانیشتوانی دۆڵی زیلان چووم و ، دەربارەی خۆ ئامادە کردن بۆ هێرش و دەست پێ کردنی بریارم دا. لەو بریارەدا ووتم: دوای پاکردنەوەی دۆڵی زیلان لە هێزەکانی تورك. بە تایبەتی شارەکانی بارگریو ئەرجیش و ئەرنیش ئەگەر دانیشتوانی ناوچەکە شاری (ئادلجوان)یشیان رزگارکرد، ئەوا هێزەکان لەناوچەکانی جەلالیو حەیدەران وئادامیو زیلان بەپەلە دەچن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە. لەسەر هێزەکانی حەیدەران پێویستە یەکەمین ئەرکیان گرتنی چیای سیپان بێت.

لەسایەی ئەو بارە شێواوە ئەبوو هێزەکانی ئارارات هێزەکانی تورکی مۆل دراوی دەوری چیاکە رابماڵن. شاری ( باشکەند) بگرن لە باکوری ئاگرییەوە تاباشوری درێژ دەبێتەوە. ئامادەی پەلاماردانە سەرشارەکانی (ئەخدەر) و (بایەزید) بن. لەسەر ئەوپێو دانسگە ئەرکی رزگارکردنی شاری ( قولپ) م بەتەمر شەمکیو هێزەکانی شەمکان سپارد. هەروەها پەلاماری (قاخزمان) بدات. وریگای قارس ـ ئاگری بگرێت. روونوسی ئەو بریارەم بۆ هەموو سەرۆکی ناوچەکان نارد. تیایدا کاتی هێرشم بەووردی دیارکرد. روو نووسێکی ئەو بریارە کەوتبووە دەست زوهدی گویفن ی ئەفسەری تورك کەدوای ئەوە لەیاداشتەکانی نووسیو دەڵێ: (( دەوڵەت خۆی بۆ هێرش کردنە سەر ئاگری ئامادەکربوو. هێز رووەو بایەزید جوولابوون. دەستوورەکانی خۆی بەسەر کوت کردنی هێزەکانی ئاگریدەردەکردچم وجوڵەکان دەستیان پێکرد. هێزەکانی تورك قاپاق تەبەیان گرت کەدەکەوێتە لای رۆژئاوای ئاگری. سەرۆکی یاخی بووەکان. ئیحسان نوری. بەیاننامەیەکی دوورو درێژی ئاراستەی سەرۆکی خێلەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی ئاگری کرد. کەلایەنگری ئەوبوون)) ژمارەیەك لەو بریارە کەلەباغەڵی کوژراوێکی کورد بوو. لە شەری قارس ـ ئاگری بەدەستی کەوتبوو. ئیحسان نوری روونوسێکی ئەو بریارەی بۆ ئیبراهیم ئاغای سەرۆك خێلی ئاداماں نارد. بریارەکە باسی ووردەکاری دەکرد بۆ سەر دوژمن لەلای سەرەوەی دەستەراست (خۆیبوون) نووسرابوو. لەژێرەوەی (ئەنجومەنی نیشتمانی کورد ) لەژێر ئەویش ژمارە. لەلای سەرەوە چەپیش (ئاگری مەڵبەندی سەرکردایەتی) لەژێریشی مێژوو (١٨ حوزەیرانی/ ١٩٣٠) نوسرابوو.

# بڕیاری هێرش کردن

ئەوبـڕیارە بەزمانی کوردی نوسرابوو و. لە حەوت خاڵ پێك هاتبوو. زوهدی گویفن وەری گێڕابووە سەر زمانی تورکی.

ئەمەی خوارەوەدەقی خاڵەکانی بڕیارەکە بوو:

١ـ دوژمن لە ١١ی حوزەیرانی ١٩٣٠ دا هێرشی کردە سەر ئاگری. بەرزایی قاباف تەپەی گرت کە دەکەوێتە ڕۆژئاوا ی ئاگری. شەش فڕۆکەی دوژمن بەشداری ئەو هێرشەیان کرد. فڕۆکـەکـانی دوژمن لەئـاسمـانی ئاگـری‌یەوە لە ١١ـ ١٨ حوزەیران. قنبلەیان بەسەردا دەباراند. سێ فڕۆکە بە ئاگری هێزەکانی ئاگری پێکران یەکێکیان لەبنکەی ئاسمانی بایەزید کەوتە خوارەوەو فڕۆکەوانەکەی کوژرا

٢ـ ئەبێ دەستە پارتیزانەکانی ئاگری دەست لە هێزەکانی دوژمنی دەوری ئاگری بوەشێنن هێزەکانی ناوەراستیش ئاگادارکران. هێزەکانی خۆیان بنێرنە تەندورەك. بۆ ڕێگا گرتن لە کاروانی باروبنـەی هاتـوو چۆی دوژمن. فەیلەقێکی عەسکـەری تورك لەباشـوری ڕۆژئاوای ئەنادۆل بەرەو ئاگری پێشرەوی کرد. بۆ پەلاماردانی هێزەکانمان. بەڵام بەهۆی ئامادەیی و جم وجۆ لی گەورەی هێزەکانمان لەدەرسیم وخەربوت و ناوچەکانی باشوری سەر سنوری سوریا. هێزەکانی تورك نەیان توانی بێنە پێشەوە.

٣ـ مەڵبەندی دامەزرێنەری خۆیبون : بەپشتیوانی خوا دەست بە هێرش بکەن بۆ سەر هێزەکانی دوژمن.

اـ ئەبێ فەرماندەی گشتی هێزەکانی دەرەك تەمر ئاغا لەئاگری و هێزەکانی ژێر فەرماندەی ئەو بەهاوکاری خێڵەکەی شەمکان کەلە قولپ نیشتەجێ بوون ڕۆژی ٣/ تەموز/ ١٩٣٠ هێرش بکـەنـە سەر مەڵبـەنـدی قەزای قولپ. دوای گرتنی شارەکە. ئەبێ پێشمەرگەکان بەردەوام بن لەسەر هەوڵدان بۆ دەسەلات بەسەر داگرتنی ناوچەکانی تر تادەگەنە گوندی (پەرنافوت).

ب ـ ئەبێ عەقید وەلی بەگ. فەرماندەی ناوچەی قورخان هێزەکانی خۆی بەئەندامانی خێلی گرکان و زیلان بەهێز بکات و. شەوی چواری تەموز هێرشێکی [illegible] بکاتە سەر ئەخدەرو بیگـرێت. لەهەمان ڕۆژیش دا هێزەکانی ئاگری پەلاماری شوێنەکانی دوژمن لە دەوری ئاگری دەدەن.

٤ـ [illegible] سەرۆکە خێلانەی لە گوندی (دەرمن)ن ئەبێ دەستور بە [illegible] بدەن. ڕۆژی [illegible] ڕێکەوتی ٤ ی تەموز بەرەو شوێنی هێزەکانی تورك بجولێ [illegible] [illegible] مۆڵیان خواردووە. ئیدارەو کاروباری ناوچە بەم شێوەیە [illegible]

ا ـ هێزەکانی ئەرجیش یارمەتی لەدوڵی زیلان وەردەگرن و پەلاماری بنکەکانی حکومەتی تورکیا دەدەن. تا دەگەنە شاری (ئادلجواز) دوای گرتنی ئەو شارە. ئەو هێزانە دەسەڵاتی خۆیـان بەسـەرلوتکەکانیچیـای سیپان دا دەسەپێنن. هەروەها بەرزاییەکانی باشوری ئادلجواز دەگرن. ئینجا هێزی سوارە روەو ئاخلات و تاتوان و چیای نەمرود دەنێرن

ب ـ سەرۆکی دوڵی زیلان : ئەبێ دەسەڵاتی خۆت بەسەر لای رۆژئاوای چیای ئالاداخ دا بسەپێنی. دوای پاك کردنەوەی ناوچەکەت لەپاشماوەی هێزەکانی تورك.

چەنـد دەستــەیەك سوارەی لێهاتوو روەو مەلازکرت دەنێری بۆ پشتیوانی کردن لەخێڵی هەسنان. ئەبێ رێگای شاری قەرەکوسە ( ئەمرۆ تورك بەوشارە دەڵێن ئاگری) مەلازکرت. باتنوس. ئەرجیش بگرن.

ج ـ لەسەر خێڵی حەیدەری نیشتەجێی ناوچەی باتنوس پێویستە لەگەڵ کەسانی خێڵی مەلازگرتی لایەنگری ئێمە. شاری باتنوس و بەرزاییەکانی باکورو رۆژئاوای چیای سیپان بگرن. ئینجا چەند دەستەیەك سوارە رەوانەی چیای نەمرودو مو ش و کوبی بکەن بۆ چاودێری کردنی جم و جوڵی دوژمن.

د ـ ناوچەی بارگری: ئەرکی هێزەکانت دەسەلات گرتنە بەسەر ناوچەکانی بارگریو وارنس وبرینی رێگای هاتووەکانی شاری وان ، ئەرجیش و سرای.

هـ ـ ناوچەی ناوەراست بە هاوکاری خێڵی دانیشتووی ناوچەی ئالکاهاریکاری خێڵەکانی جەلالیو مللان دەکـەن. ئینجـا ئەو هێـزانـە بە فەرماندەیەتی خۆم مەڵبەندی شارەکانی بایەزیدو ئاگری دەگرن. دوای ئەوەش ۳۰۰ چەکدار رەوانەی چیای تەندروك دەکەن بۆ بە هێزکردنی بەرەی جەنگاوەرەکانی بارگری. لەسەر هەموو ئەو هێزانە پێویستە هەرەشە لە شارەکانی وان وسەرای بکەن. زانیاری لەسەر ناوچەکانی وان. تار ب. سەرای. باشقەڵاو هەکاری کۆبکەنەوە.

و ـ ناوچەی ئەرجیش : هەوڵ بدە هاریکاری ناوچەی ناوەراست بکەیت.

ز ـ سەرۆك خێـلی ئادامـان. قایمقام ئیبراهیم ئاغا :پێویستە لەسەرت بە زووترین کات. تەنسیق لەگـەڵ عەلی بەگ میرزا ئاغـاو رەسـول بەگ زدلی و سەرۆکەکانی خێلی قوتان و هەسەسوری بکەیت هەمووتان بەیەکەوە. لە رۆژی ٤ ی تەموز/ ۱۹۳۰ پەلاماری شاری دیـادین بدەن ئینجـا دەسـەڵاتی تەواوی خۆتـان بەسـەر رێگـای قەرەکوسەـ بایەزیدا دابسـەپێنن. پێویستە بەشێوەیەکی تایبەتی هێزەکانی دوژمن لە قەرەکۆسە بخەنە ژێر چاودێرییەکی توند. تەنسیق لەگەڵ حەمید بەگ بکەن و رێگای تاهر بکەنە ناوچەیەکی گرگرتوو .

ح ـ دوای دەسـەڵات خستنـە سەر ئەو ناوچـانەی کە لەسەرەوە باسمان کرد. ناوچەی ئەرجیش وبـاتنـوس و زیـلان زۆربـەی هەرەزۆری هێزەکانیان، لەپشتی هێلی دوتاخ ـ

مەلازگرت ساز دەكەن. ناوچەی بارگریش هەموو هێزەكانی خۆی لە ئەرنس ـ نورشات ساز دەكات.

٥ـ مەڵبەندی فەرماندەی گشتی لە ئاگری دەبێت. زانیاریەكانتان دەربارەی بەرێوەچوونی چالاكیە عەسكەریەكان بنێرنە ئەم مەڵبەندە. دوای بە درێژی باس كردنی ئەو بریارە. زوهدی گویفن دەڵێ تاوانباری راكردوو ئیحسان نوری خۆی كردوە بە فەرماندەی گشتی. نەخشەی پێك هێنانی حكومەتێكی بۆ خۆی دارشتوە. بریارەكە بە مۆری ( ئیحسان نوری) كۆتایی پێ هێناوە. لەسەرەوەش نووسیویەتی ( فەرماندەیەتی باڵای عەسكەری هێزەكانی خۆیبون). هەموو جم وجوڵەكانی ئیحسان نوری ئاماژە بۆ ئەوەی دەكات كە دەیەوێ دەولەتێكی سەربەخۆیێك بێنێ. ئیحسان نوری (ئامۆژگاری‌یەكی گشتی) بۆ لایەنگرەكانی خۆی دەركردبوو. كەبەو بریارە لكێنرابوو ئەو ئامۆژگاریە گشتی‌یانەی كە ئەبێ لەبەرێوە چوونی شەر رەچاو بكرێن). ئەمەش دەقی ئامۆژگاریەكانە:ـ

١ـ هەر ناوچەیەك ئەبێ بۆ خۆی فەرماندەیەك هەڵبژێرێو. لەناوەكەیم ئاگادار بكاتەوە.
٢ـ ئەبێ بەپێی رێژەی ژمارەی شۆرشگێرەكان ئیدارەی زاتی بۆ ناوچەكان پێك بێت . بۆ خۆشیان ئازوقە لە ناوچەكە دابین بكەن.
٣ـ ئەو دەسكەوتانەی شۆرشگێرەكان دەستی بەسەردا دەگرن. وەكو چەك، فیشەك، تۆپ بە هەموو جۆرەكانی تفاقی عەسكەری ئەموالی حكومەت و سوپا، هەموویان بە مولكی حكومەتی كوردان دەژمێردرێن و لە شوێنی تایبەتی هەڵدەگیرێن. ئەبێ لێپرسراوێكی بۆ دابنرێو رێگا نەدەن كەس یاری پێ بكات. چونكە مولكی میللەتە.
٤ـ لەكاتێكدا ئەگەر ئەفسەرو سەربازی تورك ئارەزوویان لە هاریكاری ئێمە بوو و پەیوەندیان پێوە كردین. ئەوكاتە ئەبێ سود لە هاریكاری یان وەربگرین. بەڵام بە هوشیاریو وریاییەوە. ئەبێ بایەخ بە مەڵبەندەكانی بێ سیم بدرێت. دەزگاشكاوەكانی تەلەفۆن و تەلەگراف چاك بكرێنەوە، سوود لە شارەزایی ئەو فەرمانبەرانە وەربگرێت كە جێگای بروان. تەنیا هێلی نێوان خۆمان و دوژمن بپچرێنن. ئەبێ فرۆكەخانەكان، فرۆكەكار لێیان نزیك بێتەوە، زوهدی گویفن دەسكاری هەندێ لە بریارەكانی كردووە. هەربە مەبەست ئەو خاڵانەی فەراموش كردووە كە باسی شێوەی هەڵس و كەوت دەكات لەگەل دیلەكانی‌تورك

بەمەبەستی ئیدارەكردنی كاروباری هێرشەكە هەردوو كورەكانی حسین پاشا كور (مەحوو نادر) و سەید رەسول بەرزنجی لە دانیشتوانی ئەر جیش. سەفدین بەگی كوری فتح الله بەگی سەرۆكی پێشووی خێلی هەسنیم لەگەل كۆمەڵیك سوار نارده دۆڵی زیلان دوای بەسەرچوونی ئەو ساڵە پر لە گیروگرفت و نارەحەتیە. بیرم لە پێدا چوونەوەیەكی ووردەكردەوە لە چۆنیەتی بەرێوەچوونی چالاكیە سەربازیەكانیان و ئەنجام دانی

گۆرانكارییەكی زۆر كەبەسود بۆ جولانەوە شۆرشگێری یەكەمان دەگەڕایەوە.
رۆژێك دەستەی داو . كوری برو لە تاریكی شەودا هێلی پەیوەندی دوژمنی لە نێوان قاپا قاتـەپـەوو مەلبـەنـدی بری بۆ ئەوەی عومـەر بەسی لە پشتی قاپاتە پەوە هێرش بكات. دەستـەیـەك سەربـاز كە ژمارەیان ١٥ كەس بوو هاتن بۆ چاكرد نەوەی هێلی پەیوەندی بەمەلبەند لە شوێنەكانی خۆیان لە چیابەرەو دەشتاییەك هاتنە خوارەوە. دەستەی دوو رێگای بێگرتن. شەرێكی یەك سەعاتەی لەگەڵ كردن لە ئەنجام دا دەستەكەی دوژمن هەر هەموویان كوژران و چەكەكانیشیان دەسكەوت بوو سەربازەكان لە پایگای قاپاق تەپە لەو بەرزاییـەوە تەمـاشـای هەڤـالەكانی خۆیان دەكرد كەیەك لە دوایەك دەكوژران. بەلام جـەسارەتی تەواوی ئەوەیان نەبوو فریایان بكەون و رزگاریان بكەن.
هەر لەو كاتەدا دوو دەستەی بچووك لە شۆرشگێرەكان سەربازگەكەیان مەشغول كردبوو جار جارە تەقەیان لێ دەكردن مەبەستیش لەوە بەهەلەكردنی دوژمن و شاردنەوەی دەستەی عومـەر بەسێ بووكـە لەژێر پەردەی تاریكی شەو دزەیان كرد دەوروبەری سەربازگاكەی دوژمن ئەگەرچی شوێنەكەیان باش نەبوو بەلام لەگەڵ ئەوەش دا.
چەنـد كەسێكیـان كوشت و چەكـەكانیان دەسكەوت بوو بە هۆی سەختی سەربازگەكە دوژمن نەیان توانی زیاتر بچنە پێشەوە دەستەی عومەر بەسێ و ئەو دەستە بچوكانەی بۆ سەر لێ شێواندنی دوژمن چووبوون بەمەبەستی مەشغول كردنی دوژمن تانیوەرۆ ووردە تەقەیان لەگەڵ كردن.
پێویستە. بڵێم كاتی توركەكان قاپاق تەپەیان گوت هێشتا ئالای سەربەخۆیی كورد بەو بەرەوە لەسـەر تەپـولكەیەك دەشەكایەوە لەبەر ئەوەی ئێمەنەمان دەتوانی هێزێك بۆ پاراستنی ئەو ئالایە بنێرینە سەر ئەو تەپولكەیە بۆیە بەینە بەینە یەكێكمان دەنارد بۆ پاراسنی ئالاكـە بۆ ئەوەی توركیش ببینێت وبزانن ئالاكە پاریزگاری هەیە. بۆیە نەیان دەوێرا لێی نزیك بكەونەوە. ئەوەو لە كاتیكاریگامان بۆ باكووری ئاگری بەنیو قەدی ئەو گردەداتێ دەپـەری كە ئالاكـەمـانی لە ئامیزگرتبوو ئابەم جورە ئەو ئالاپشتی باكووری رۆژئاوای دەپاراستین هاوین لەسەرچیای ئاگری وەكو ئاگر دەسووتا میش گەلیك زۆر بوو. ئەو ژیانە بۆ ئێمەی كورد گەلی سەخت بوو.
بۆیـە هەر كاتێ پلەی گەرما بەرز دەبووەوە ئێمە بۆ لوتكەكانی ئاگری هەلدەكشاین بۆ كوێستانەكەی كورد بە ئاوو هەوای خۆش و هاوینان بە هۆی پەیدا كردنی پاوان بۆ ئاژەڵ و مەرو مالاتەكانیان دەچوونە لە وەرگاكان. بـ ویە ناچار دەبن خانووە زستانیەكانیان بەبێ پاریـزگـاریو چاودێـری جێ بهێلن توركـەكـان دەرفـەتی رۆیشتنمان بۆ پاوانەكانیان قۆستەوە. شەو هێزەكانی خۆیان گەیاندە دەوروبەری گوندی شەخلو. هاتنە ناو خاكی ئاگـری. تەپۆلكەكانی رۆژئاوای گوندی شەخلویان گرت. چادریان لێ هەلدا. دەستەیەك

لەهێـزەکـانی ئاگـری بە مەبـەستی دەرکـردنی دوژمن لە چیـا هاتنـە خوارەوە. هێشتا هێـزەکـانمـان نە گەیشتبوونە ئەو ناوچەیەی کە ئەبوو تەقە بکەن. دوژمن چادرەکانی پێچایەوە و بەرەو بایەزید کشانەوە. ئێمەش لەو کارە حەپەساین. عەقڵی ناچیتێ بە هۆی دابەزینی هێزەکانی ئاگری رووەو شەخلو کشابنەوە. چونکە دوژمن ئەوەی حیساب کردبوو کە تەنیا بە پەرینەوە لە سنووری ئاگری دەبێتە جێ نیشانی هێرشەکانی کورد لە کاتێکا سوارەکانی ئاگری لە دۆڵی زیلانی هێشتا دەستیان بە هێرش نەکردبوو. هیچ هەواڵێکمان لەوان پێ نە گەیشتبـوو. واتـە هیـچ هۆیـەکی مەنتیقی و زانراو بەو کشانەوەی پێش قەرەولەکـانی دوژمن نەبـوو بۆ سەر ئاگـری! لە ناوچـەی دۆڵی زیـلان چەنـد کۆمـەڵە چەکدارێکی لە خێڵەکانی حەیدەران قالقان بەکران و ئادامان هەبوو. محو تەمر ئاغاو محو دەرویش ئاغاو تاهیر عەلی بەگ لە سەرۆکەکانی قالقان بوون. رەشو سلو سەرۆکی بەکران بوو. لەو سەرۆکـانە محو دەرویش ئاغا جێگای بڕوای لێپرسراوەکانی حکومەت بوو لە ئەرجیش. لە سەر بناغەی ئەو بروا پێبوونەوەو بە مەبەستی گفتوگۆ بانگی لە ئاغاکانی ناوچە گیرایەوە. داوای زانیاری لە سەر کۆبوونەوەی ئەو چەکدارانە لێ کردن فەرماندەی دەرەکی تورك واتێگیشتبوو کە محو دەرویش ئاغا بەرژەوەندی گەلەکەی کردۆتە قوربانی ئەو قسـە شیرینـانـەی کە لێپـرسراوە حکـومیـەکانی تورك بۆی دەکەن. نەیدەزانی کە ئەنـدامێکی خۆیبـون دانیشتوانی دۆڵی زیلان بە خۆشی و شادیەکی زۆر پشوازیان لە سوارەکانی ئاگری کرد. کە بریاری راگەیاندنی هێرش کردنە سەر هێزەکانی تورکیان پێبوو. ئەو هەواڵە خۆشـە بە جۆرێ سەری لێ شێـوانـدن کە ئاگـاداری کاتی دەستەپێکردنی هێرشەکە نەبوون هەر وەکو لە بریارەکە هاتبوو. ئەوان پێش کاتی دیاریکراو هێرشیان کردە سەر (حسن ئابـدال)، حسن ئابدال سەربازگە یەك بوو دوو سەد سەربازی لێبوو. دوای شەرێکی قورس. کوردەکان توانیان سەربازکەکە بگرن. پاشماوەی هێزەکەیان گرت و دەستیان بەسەر چەکەکانیان داگرت. پاشان هێرشیان کردە سەر شاری نو شاری مەڵبەندی ناوچـەی زیـلان. تابـورێك پیادە لە شار بوون. پشتیان بە ژمارەیەك رەشاشی مەترەلۆز بەستابوو. فەرماندەی شارەکەش لە قەڵاکە خۆی قایم کرد بوو. بە مەبەستی رووبەروو بو ئەوەی هەر رووداوێك دەوری قەڵاکەی بە چەکی دیفاعی بە هێز کرد بوو. بەڵام ئەوەی بەفکـردا نەهاتبوو کە گیرۆدەی شۆرشگێری لاسار دەبێتەوە. نازانن مانای تریش چیە. گیانازی لە پێناوی ئازادی گەلەکەیان دەکەن. کاتێ کوردەکان هێرشیان کرد سەر نوشار. مانای ئەوە نەبوو ئەوان شارەکانی ئەرجیش وبازگرییان لەیاد چووە،.

بەڵکـو زۆر بە پەلەو بەتـوندی هێرشیان کردنە سەر. سەرکردەکانی هێرشەکە لەگەرمەی شەردا بوون چێژی شەوو سەرکەوتن مەستی کردبوون ئەوەی لە بیر برد بونەوە کاتی هێرشەکانی خۆیانم پێرابگەیەنن!.

بۆیە لەگەڵ سەرۆکی ناوچەکان چاوەرانی گەیشتنی هەواڵی رۆژی دەست پێکردنی شەرمان

دەكـرد. تاكـو ئێمــەش لە هەمــوو ناوچەكان. وەلەیەك كات دا بانگی شەر رابگەیەنین.
سەرباری هەموو ئەو قایمكاریانەی سازیان كردبوو. كەكاری مقاوەمەت و بەرگریان ئاسان كرد بوو. لەگەڵ ئەوەش دا نەیان توانی زیاتر لە ٢٤ سەعات خۆیان لەبەردەم لافاوی هێرشی قارەمــانــەكـانی خێـڵی ئادامــان بگرن كوردەكان زیانێكی گەورەی‌گیانیان لێ دان تەنانەت فەرمــانــدەی تركــەكان كوژرا. ئەو سەربازو ئەفسەرانەش كە لە چنگی مردنی مسۆگەر رزگـاریــان بوو. بەدیــل گیران. لە رۆژی دواتر كورد. پەلامار دەرەكان بەشێكی تەواوی شارەكـانی ئەرجیش وبـارگـریــان گرت. بەڵام هێشتــا هێزەكانی تورك لە بەشەكانی تری شارەكانی ئەرجیش وقەلای بارگری بەرگری یان دەكرد. شۆرشگێرەكان دەستەیەكیان نارد بۆ برینی رێگای نێوان ئەرنس. وان بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا بوون بەقوربانی اهمالی و. ئەو سەركەوتنە مەزنەیان دۆراند كە بە گیانفیدا كاری‌و ئازایەتی بەدەستیان هێنا بوو. بەمەش وەزعی دوو دڵی تورك لە ئەرجیش گۆرا بەوەزعێكی باشتر. مەسەلەكە بەم جۆرە بوو: تورك لە مەڵبــەندی وان چەند تۆپێكیان لەگەڵ دەستەیەك ئەفسەر بۆ رزگاركردنی شاری ئەرجیش نارد. كوردەكان لەنزیك ئەرجیش روو بە روویان بوونەوە. دوای شەرێكی نیو سەعات خوێناوی توركەكان بینیان جیا لە خۆ بەدەستەوەدان هیچ رێگایەكی تریان نیە.
ئەو خۆبــەدەستــەوەدا نەی تورك كوردەكـانی بوغـرا كرد. لە جیـاتی ئەوەی هەنــدی لەجــەنگــاوەر لە سەنگــەرەكـان جێ‌ بهێڵن. هەنــدێكی تریشیــان بچن و دەسكەوتەكان كۆبكــەنــەوە. هەمــوویــان سەنگــەرەكـانی خۆیــان جێ‌هێشت و بەرەو كۆكـردنــەوەی دەسكەوتەكان چوونە خوارەوە. كاتێ فەرماندە توركەكە زانی ژمارەی كوردەكان زۆر كەمە لە خۆ بەدەستەوەدان پشیمان بووەوە. یەكسەر دەستوری بە دەست پێ‌كردنەوەی شەردا. لە ئەنجــام دا سەرۆكی شۆرشگـێرەكـان لەگەڵ چەند كەسێكی‌تر كوژران. ئەوا نەش كە مابــوون تادوا فیشــەك مقـاوەمــەنــان كرد. مردنیان لامەزنتر بوو لە شەرمەزاری خۆبە دەستەوەدان. بەم جۆرە هێزە یارمەتیدەرەكەی توركگەیشتە ئەرجیش، یەكەمین هێرش بۆ سەر شاری ئەرجیش لەلایەن جەنگاوەرەكانی خێڵی بەكران بوو ئەوان چەك و تفاقی شەری تەواو یان نەبــوو. تەنــانەت ئەو دەستەیەی بنكەی ئاسمانیان گرت تفەنگیان پێ‌نەبوو بەڵكو ئەو كسانە بە داس و پاچ و بەرد هێرشیان كرد مردنیان بە ئازایەتی پێ باشتر بوو لە ژیانی سەر شۆری بە خۆشحالیەكی مەزن بەرەو ئازادی تەكانیان دەدا. لە ئەنجامی ئەوە هەندێ قوربانیاندا بەڵام توانیان سەربازەیاساولەكان لە بنكە ئاسمانیەكە بگرن و چەكەنیان لێ‌بسێنن. و یەكسەر بەكاری بهێنن.
توانــیـــان دەســت بەســەر دوو فرۆكــەدا بگــرن كە خەریكی فرین‌بوون. پاش سود لێ وەرنەگرتنیان ئاگریان تێ بەردان. مەمەد بەگی كوری‌حسین پاشای كورە بە فەرماندەیەتی دەستــەیەك جەنگاوەر چووە سەر شاری باتنوس.و پەلاماریان داو چوونە ناو شارەكەو گرتیــان. بەڵام سەربــازی حامیەكە باش خۆیان قایم كرد بوو . رەشاشی مەترالوزیان لە

سەربانی مزگەوت و بەرزایی منارەکان دبەستبوو بۆیە شۆرشگێرەکان نەیان توانی زیانێکی ئەوتـۆ بە سەربازگەی شارەکە بگەیەنن شۆرشگێرەکان پێش ئەوەی پەلاماری شار بدەن دەسەلاتیان بەسەر رێگای قەرەکوسە ـ ئەجیش دا گرتبوو. هەندێ ئەفسەریان گرتبوو کە لەلای باتنسەوە لەگەڵ هەندێ سواری خێلی سەبکویی هاتبوون و هەموو چەکەکانیان لێ سەندراو. خۆشیان تەسلیم بەسەید رەسول کردن. سەفدین بەگی کوری فتح الله بەگی سەرۆکی پێشووی خێلی هەسنان بەفەرماندەیەتی دەستەیەك سوارەی ئازا رومو دەشتی مەلازگـرت بە رێکـەوت . لەوێش ئاگری شەریان هەلگیرساند. راپەرینی دۆلی زیلان. لە ئەنجامی پەلە کردن. دەست پێکردنی هێرش لەپێش رۆژی دیاری کراوی بریارەکە وای کرد ئەو راپەرینەتەنیاو گۆشە گیربێت.

حکـومەتی تورکیش لە هەموولایەکە وەهێزی رەوانەی سەرکردن. لە شارەکان جۆگەلەی خوێنیان هە لـەست. هێزەکانی تورك بە هاوکاری جاشەکانی هێلی کەسکویی بەرەودۆلی زیلان پێشرەوی یان کردو جارێکی تریش شاری حسن ئابدالیان گرتەوە. هێزەکانی ئاگری نەیان دەزانی کە خێلی حەیدەران لە پێش رۆژی دیاری کراو کەلەسەری رێکەوتبون ئاگری شەریـان هەلگـیرسـاندووە. بۆیە کاتی هەر لە چاوەروانی گەیشتنی هەوالی دیاری کراو مابـوونـەوە. هێـزەکـانی دوژمن لە هەموو لایەکەوە ئابلوقەی خێلی حەیدەرانی دابوو. تاوانەکە بە پلەی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی مەمەد بەگ و سەید رەسول کە هەوالی دەست پێکردنی شەرەکەیان نەگەیاند بوو.

هۆکارەکانی یارمەتی تورکیدا بۆ سەرکەوتن ئەمانەن :ـ

١ـ عقید ئیبراهیم اغا و حمید بەگ زیلانی ئەو ئەرکانەی پێیان سپێردرا بوو جێ بەجێیان نەکرد.

٢ـ گیانی چاو بەستەکیو اهمالی و بێمبالاتی لەشەرەکاندا.

٣ـ لە هەموو ئەوانە خراپتر سەرهەلدانی ناکۆکیو رقە بەرایەتی نێوان مەمەد بەگ و سەید رەسول بوو. لەراستیشدا هەق بەلای مەمەد بەگ بوو.

٤ـ لە هەمـوو شتێـك گرنگتـر دەست پێکـردنی شەر بوو لەپێش کاتی دیـاریکـراودا کەسەرکردایەتی دەست نیشانی کرد بوو. ئاگادار نەکردنەوەم لە زانیاری سەرەتایی دەست پێکردنی هێرش وچۆنیەتی شەرەکان. هەر بۆیە نەیان توانی لە پشتەوەرا خۆیان بپارێزن.

٥ـ خیانەتی خێلی کەسکویی: ئەگەر ئەو کارە خیانەتکارییە نەبوایە هێزەکانی تورك نەیان دەتوانی بچنە ناو خاکی دولی زیلان.

سەرکەوتنی تورك بەهۆی اهمالی و بێ ئاگایی دانیشتوانی دولی زیلان بوو!.. سەربارەی شەرە قسـەی نێـوان دوو فەرماندەی کورد. کە مەمەد بەگ حسین پاشاو سەید رەسول بەرزنجی بوو. ئەو شەرە قسەیەش رەنگدانەوەی دەمار گیری کوێرانەی خێلەکایەتی بوو.

که به شێـوەیەکی سلبی کاری کردە سەر  وورەی شۆرشگێرەکان و ریزەکانیان تێك چوو وبڵاوەیان لێ کردو هەر کەسەو بەلای ژن و منالەکانی خۆی لە هەواری چیاکان رۆیشت. لە نزیك ئەو هەوارانە رووبەرووی دوژمن بوونەوە و توانیان ریگای خۆیان بکەنەوەو ژن و منالەکانیان بگەیەننە ئاگری.

سەیـد عبدالقادر کوری مامی سەید رەسول. ماڵ و خێزانەکەی خۆی لە ئەرجیش بە جێهێشت و بەیوەندی بە ئاگرییەکانەوە کرد.

لە شەری ئەرجیش کوردەکان دەستیان بەسەر دوو فروکەدا گرت. یەکێکی تریشیان لە ئاسمـان پێکـاو خستیـانە خوارەوە. ئەم فرۆکەیە چەند سەعاتێك پێش پێکرانی لەسەر سەنگەرێك دەسورایەوە. کە پێی وابوو هێشتا بە دەست تورکەوەیە. بۆیە بەنزمی دەهاتە سەر ئەو سەنگـەرە تاکـو زانیاری پێویستیان بداتێ. دوای خستنە خوارەوەی لەلایەن کوردەکان. ئەو راپورتە زانیارییە کەوتە دەستم کە بە درێژی باسی لە پێشرەوی هێزەکانی تورك دەکرد بەرەو ناوچەی شۆرشگێرەکان و ئەرجیش.

## - سۆڤیەت و ئێران یارمەتی تورکیا دەدەن -

لەو رۆژانـەدا هێـزەکانی تورك لەناو خاکی ئێران. لە رۆژهەلاتی ئاگری بچوك هێرشیان دەکردە سەرمان. ناوچەی(سەرداربولاخ) یان داگیر کرد. لەبەر ئەوەی هێزەکانی ئاگری لە رووی چەنـدایەتیەوە ژمارەیان وەکو پێویست نەبوو تا بتوانن هەموو لایەکانی ئاگری بپارێزن بۆیە هێزەکانی تورك بەئاسانی ئەو ناوچەیان گرت و لێی دامەزران. کاتی نوێنەری ئەرمەنە تاشناقەکان ئەمەی بینی ووتی: ئەگەر لە ماوەی ٢٤ سەعات لە ئاگری نەچینە دەرەوە ئەوا بێگومان هەمووومان دەکەوینە چنگی تورکەکان. پێشنیازی بۆمان کرد کە هەر ئەو شەوە ئاگــری چۆل بکـەین. بەلام کوردەکـان کە ماوەی پێنــج ساڵ بوو چێـژیـان لەسەربەخۆی وەرگرت .ئامادە نەبوون هەروا بەئاسانی. وە بە هەچ شێوەیەك بێت. دەست لەو ئازادیەو سەربەخۆییە هەلبگرن و ئاگری چۆل بکەن. مەلبەندی شۆرش جێبهێلن و بکەویتە دەستی دوژمن. هەر بۆیەش فەرماندەی کورد وەلامی دایەوەو گوتی:. ((راستە لە نێو ئەم دەریایەی دوژمناندا نەخنکان دژوارە. بەلام ئێمە کوردین. لە گەمارو ناترسین هەر کاتی بمانەوێ. هەر چەند گەمارو تەنگترو زورتر بێت دەتوانین بیشکێنین و لە خۆمانەوە نامانەوێ لە ئاگری بچنە دەرەوە)).

نوێنەرەکانی ئەرمەن پێیان لەسەر داگرت و دەیانگوت : قەیدی ناکا. با هەر فەرماندەی کورد خۆیو خێـزانی لەئـاگـری بچنە دەرەوە. وەلامی سەرکردەی کورد وەها بوو. ئەم پێشنیازەی تۆ ناهێژایە: من لە پێناو ژیانی تایبەتی خۆم. دەست لە ئازادی نەتەوەکەم

ناکێشمەوە. گیانی من لە هەڤاڵەکانم. لەم قارەمانانە خوشەویسترانیە ژیان و مردنم یەکە. من هەرگیز لێیان دانابڕێم:

ئەگەر ڕێکەوت ئێمە هەموومان پێکەوە بمرین: تۆ بۆ خۆت دەبینی سی چل هەزار نەیار چوار دەوریان لێگرتووین. لە بەرامبەر هەر پێشمەرگەیەکی ئێمەدا. سەدو پەنجا سەر کەمتر وەستاوە. تۆپ و بۆمباو فرۆکەش زۆرن . مانەوەت لەلای ئێمە ئیدی پێویست نیە. هێشتا بازنەی گەمارۆیان بە تەواوی لە چوار دەورەی ئاگری نەکێشاوە. هێزەکانی تورك کە تازە هاتونەتە سەردار بولاخ. ئەمشەو ناتوانن لای خۆیان پتەو بکەن. سود لەم دەرفەتە وەرگرن. شارەزاکانی خۆشت ببەو ئەمشەو لە ئاگری وەدەرکەون.

فەرماندەی کورد. چووە لای جەنگاوەرەکانی خۆی و نوێنەری ئەرمەنیش لەگەڵ هەڤاڵەکانی خۆی چوون و سازدانی جیگە. ئەو شەوە لە ئاگری چونە دەرەوە کاتی ڕۆیشتن ویستبویان خێزانی فەرماندەش لە ئاگری دەرباز بکەن. گوتبوویان :.

(ئیحسان نوریش لەدوای ئێمە دیت) ژنەکە لە وەڵام دا گوتبووی:ـ هەر مەترسییەك بو ئیحسان نوری هەبێ. منیش هاوبەشم. هەرگیز ئەو لەنێو ئاگریدا بە جێ ناهێڵم. خۆم دەربازناکەم ئێوە برون خوا ئاگادارتان بێ )).

ڕۆژی دواتر فەرماندەی کورد زانی کە تیپێك لە هێزەکانی سۆفیەت. بۆ یارمەتی هێزە دوژمنکارەکانی تورك هاتوون. لە ئاوی ئاراس پەڕیونەتەوەو دەوروبەری باکوری ڕۆژهەڵاتی چیای ئاگری بچوکیان داگیر کردووە. ئەمە بۆ تێکۆشەرانی کورد گرنگ نەبوو. چونکە ئەوان لە نێو دەریای دوژمندا کەوتبوون. ئاوی ئەو دەریایەش بۆ خنکاندنیان یەکجار زۆر بوو . هەرکاتی زۆرتریش ببوایە هیچ لەمەسەلەکە نەدەگۆڕا تێکۆشەرانی تورکیا ئاگری لەبەرامبەر ئەو هێزە مەزنەو هاوکاری دەولەتیسوفیەت و ئیرانیش لەگەڵ تورکیابۆ لە نێو بردنی ناوەندی شۆڕش. شورشگێرە ئازاکانی کورد. تێگەیشتبوون کە بەرگری قورس. بۆ پاراستنی هیچ کەلك و سودێکی نیە. بەتایبەتی لەکاتێکا کە ئەو هەموو ژن و مناڵە بوو بوونە جێنیشانی ئاگری دوژمن و . پارووێکی ئامادە کراوی نێوان ددانی دوژمن. ڕزگار کردنی ئەو کۆمەڵە خەڵکە کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا نەبوو بە هۆی ڕووخاندنی وورەی شورشگێرەکان. سەرکردەکانی ئاگری کۆبونەوەیەکیان کرد دوای مناقشەیەکی ووردو چارەنوس ساز بڕیاریان دا تا خوێن لە دەمارەکانیان دا مابێت ئاگری جێ نەهێڵن. لەسەر مقاوەمەت بەردەوام بن و دیفاع لە ئاگری بکەن کە هێمای کەرامەت و سەربەرزییانە|هەروەها بڕیاریان دا دوای تەواو بوونی فیشەك بە خەنجەرو دەست هێرش بکەنە سەر دوژمن. کە دەیانەوێ ئەرکانی قەڵای سەربەستی کورد تێك بشکێنن. کوردەکان بڕیاریان دا سکی دوژمن هەڵدڕن و بە ددان پارچە پارچەیان بکەن. ئەگەر پێویستیشی کرد شەرابی مەرگ بنوشن. لەبەر ئەوەی کوردەکان ناتوانن بەردەوامی بە کاروانی ئازادی

گەلەکــەیــان بدەن بەرەو ئاەـانجــە دیــاری کراوەکان. با بەلای کەمەوە لە پێناوی بیرو باوەرەکانیاندا شەهید بن. سەر بەرزبن. ئەمە بکەنە گەواهی قوربانی دانیان لە پێناوی دابــین کردنی مافــەکانی گەلی کورد. ئەمە باشترین یادگاری‌و . دەلیلی کارە بۆ نەوەکانی داهاتوو دەمێنێتەوە.
دیمەنێکی چەند جوان بوو کەتۆ دەتبینی ئەو شێرانە داستانی بێ‌وێنە یان دروست دەکردو قەلای مردنیان شەق دەکرد. دڵ و دەروونیان پر بوو لە خۆشەویستی نیشتمان و ئازادی. لەو کاتەدا دەتگوت ئاگری هاوبەشی سۆزو کارەساتی رۆڵە دلێرەکانی خۆی دەکرد. لەگەڵ ئەوان سرودی دەووتەوە:ـ

نیزەی تورکان. زگانیان دراند
بەخوێنێ کوردان. سور بوون دۆڵەکان
دەنگی تفەنگان. چیایان لەرزاند
میر خاسانی وولات. هاوارە بکەنێ

## دەریای دوژمنان .

پەلا ماری دلێرانی کورد دەستی پێ کرد. بەلام چ فایدە. وەکو گوللەیەك وابوو بیهاوێژنە نێو دەریاو لە شەپۆلە سەرشینەکانی رودەچوو. ئیتر نەدەگەرایەوە لەدوایدا خورەی ئاو رایدەمالی. لە راستی‌دا رێژەی هێزەکانی کورد بەرامبەر هێزەکانی تورك وەکو دلۆپێك بوو لە دەریایەك. ژیان هێژایی خۆی لە دەست دابوو. کوشتن و کوژران کارێکی ئاسایی بوو.
شۆرشگێرەکان لەبەرەی (قورخان) لە لای باکوری چیای (کوپکول) کە لەژێر دەسەلاتی تورك بوو چەنـد هێرشێکی توندیان کرد. توانیان دەست بەسەر هەندێ شوێن دابگرن. تورکــەکانیان ناچار کرد. روەو (قاباق تەپە) بکشێنەوە.هەروەها شۆرشگێرەکان بروسکە ئاسا دوو هێرشیان کردە سەر (مێخ تەپە) و (لوتکەی ئاگری) دوژمنیان لەوی تارو مار کرد. بەلام نەیان توانی نیشانەکانی خۆیان بپیکن. چونکە قەوارەی هێزەکانی دوژمن یەکجار زۆر بوو. شۆرشگێرەکان دیلەکانیان چەك دەکردو یەکسەر ئازادیان دەکردن . ئەو ناوچەیەی لە ژێر دەسەلاتی ئاگری‌یەکان بوو وەکو پێویست سووتەمەنی لێ نەبوو هەروەها کەم ئاو بوو. برسیتی چرنووکی گیر کرد بوو. هەر چۆنی بوو. شەر چەند رۆژێك بەردەوام بوو. سەرباری ئەو هەموو زروف و دژواری‌یە فرۆکەکانی تورك بە بەردەوامی قەلای ئازادی کوردستانیان بوردومان دەکرد. قوربانی زۆر بوو. بریندارێکی کورد هەبوو کە پارچەیەك ئەژنــۆی کردبــووە چەند لەت. ئەگەر چی هیوای ژیانی نەمابوو بەلام لەگەل ئەوەشدا وورەی بەر نەدابوو وێنەیەکی ئازایەتی و بەجەرگی پیشان دەدا. کاتی فەرماندەی کورد بوو هەواڵ پرسینی هات پێی ووت. من تەمەنێکی زۆرم بەسەر بردووە. چاکیش دەزانم کە

برینەکەم ـی چاك بوونەوە نیە. بێگومان دەمرم. بەڵام سوپاس بۆ خوا کەوای کرد لەڕێگای ئازادی گەلەکەم بمرم. من بەخۆشحالیەوە دەمرم. دەشزانم کە زیانی تر بە رۆڵەکانی ئاگری ناگات. تا ئێستا شۆڕشگێڕەکان سەلامەتن. دڵم ڕێگای نەدام هەواڵی کوژرانی ئادو ئەمکی پێ بڵێم لەو بوردومانەدا. پاش چەند رۆژێك هێزەکانی ئاگری. لەتاریکی شەودا رووەو شاری باشەند. کە دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی ئاگریو رۆژهەڵاتی دەشتی ئەخدەر. مەڵبەندی ناحیەی ئارالق کشانەوە. دانیشتوانەکەی تورکمان بوون. نزیك ئاوی ئاراس بوو ـ لەسەر سنووری سۆڤیەت. پێش بەرە بەیان شەر دامەزرا. هێزەکانی کورد. سەعاتێك دوای رۆژ هەڵات توانیان دەس ت بەسەر شارەکەدا بگرن.

هێـزەکـانی تورك ـە شارەکە کشانەوە. هێزەکانی کوردیش بە دوایاندا. شەر درێژەی کێشا. کوردەکان ڕێگای کشانەوەی هێزەکانی تورکیان رووەو ئەخدەر بری. بۆیە نەیان توانی بکشێنــەوە. ناچــار بوون رووەو سنوری سۆڤیەت بکشێنەوە. بەم جـۆرە زیانی ز ۆریان لێکەوت. نیوەی هێزەکانیان بە دەستی کوردەکان بەدیل گیران. ژمارەی ئەو هێزە نزیکەی ۱۵۰ کەس بوو. کوردە شۆڕشگێڕەکان (۳۰) کەسی تریان لەناو شار لێ بەدیل گرتن. باقیـەکەی تریشیان بە کەناری رووباری ئاراس. رووەو سنوری سۆڤیەت رایان کرد. هێزەکانی سۆڤیەت بە چەکی تفەنگ و رەشاشەکانیان ئاگر بارانی کوردەکانیان کرد. بەم جۆرە سەربــازە تورکــەکــان لە چنگی کوردەکان رزگار بوون. وچوونە شورەوی. دواتر. زانیمـان کە حکـومـەتی یەکێتی سۆڤیـەت بە چوونی ئەو سەربازانە خۆشحاڵ بوو. بە تەواوی چەك و جبە خانەوە بەناوچەی (نار قارا) راگەراندبوویاننەوە شاری ئەخدەر.

دانیشتــوانی باشکەند بە چوونی هێزەکانی ئاگری خۆشحاڵ بوون. بە گەرمی بەخێر هاتنیان کردن. قوربانیان لە بەر دەم ئاڵای رزگاری کوردستان سەربری. کە لە سەربانی مەڵبەندی حکومەتی ناحیەی باشکەند. لە شوێنی ئاڵای کوماری تورکیا دەشکایەوە. مەلا حسـێن. تێکۆشەری نیشتمانپەروەری مەزن . کە لە ناوچەی وان هاتبووە ئاگری خۆی لەگەڵ خێڵی گەلتووری دەژیا. لەگەڵ عومەر باسی سەرۆك خێڵی گەلتووری بریاریان دا پاش هێرش کردنە سەر باشکەند لەگەڵ هێزێك بچن تاشبورون داگیر بکەن و ڕێگای ئیمدادی هێزەکانی تورك ببرن (ئەم تاش بورونە، ئەو تاش بورونە نیە کە سەر بە بایەزیدە بەڵکو شوێنێکە دەکـەوێتـە ســەر ڕێگـای نێـوان ئ خـدەرو باشـکەند ـ نووســەر)ئـەوان تـا نیـوەی رێـگـا چـوو بـوون بەڵام هیـچ شوێـنـەوارێکی هێــزەکـانی تورکیـان نەدیبوو. بۆیە گەرابوونەوە باشکەند. ئەو شەرە هەشت سەعاتی خایاند. زوهدی گویفن دەربارەی ئەو شەرە دەڵێت: لە دووەمین رۆژی ئەو شەرە تورکیا تیپێك سەربازی نارد. تاش بورونی ناو بروایان داگیر کرد. پاش چەند رۆژێك لەوە. بەمەبەستی خۆ پاکردنەوە لە هەڵەی پێشو عومەر بەسی سەرۆك خێڵی گەلتوری ـ سەرکردایەتی هێزەکانی خۆی کردو بە مەبـەستی گرتن هێرشی کردە سەرتــاش بــــورون. زۆر دلێرو قارەمــانانە شەریان کرد

سەربازەكانیان زراو توقیو كردو ناچاریان كردن چادرەكانیان جێ بهێڵن و رابكەن. بەڵام بەداخەوە لە گەرمی شەرەكەدا گوللەیەك سنگی ئەو قارەمانەی پێكاو شەهیدی كرد. جەنگاوەرەكان بەردەوام بوون لەسەر شەڕێكی سەخت و. توانیان چەند تەپولكەیەك لە دەست توركەكان دەربهێنن. بەڵام هەر لەو كاتەدا هێزێكی پشتیوانی لە (ئەخدەر). وە بەرێگای ئۆتومبیل فریای توركەكان كەوت. بۆیە كوردەكان نەیان توانی ئەوتەپۆلكانە بپارێزن كە رزگاریان كرد بوو. هەروەها فەرماندەكەشیان شەهید بوو بوو. بویە ناچار بوون لە ژێر گوشاری تۆپ بارانی خەست و دەنگی مەترەلوزی رەشاش بكشێنەوە بنكەكانی خۆیان. زوهدی كویفن دەربارەی ئەو شەرە دەڵێت : لە حەوتی ئاب رێگرەكان لە ناوچەی ئارالق (مغامرەیكی استعرازیان) كرد. ئێمەش یەكسەر تابورێك پیادەو. چوار تۆپمان بە فەرماندەیەیەنی فەرماندەی تیپ كامل بەگ ناردە تاش بورون . نیوان ئەخدەروئارالق.

سەربارەی ئەوە فەوجێكی سوارەو تابورێك لە هێزەكانی سنوری سەر بە (ئەخدەر)مان خستە ژێر دەسەڵاتی ئەو تیپە. لە تاش بورك هێندەی نەمابوو دووچاری كارەسات ببن لە ٩ ی ئاب فەرماندەی تیپ بە تەلەفۆن ئاگاداری كردینەوە. كوردەكان نیازیان وایە لە ناوچەی ئارالق هێرش بكەن. دوای ئەو هەواڵە فەوجێك لە هێزەكانی سنورلەگەڵ تابورێك لە تیپەكەی ئێمەو هەندێ هێزیتر بە فەرماندەیەتی فوئاد بەگ چوونە ناوچەی ئارالق. دوای ئەوە زانیمان كوردەكان شەو هێرشیان كردە سەر تاش بورون. ژمارەیەكی زۆریان لە ئەفسەرو سەرباز كوشت و بریندار كرد. دوای لێكۆڵینەوە لە مەسەلەكە زانیمان ئیحسان نوری بەخۆی و چوار سەد كەسەوە پەلاماری هێزەكانیان داوین لەبەرەی ئارالق. هێرشی كوردەكان بە مەبەستی دەست بەسەراگرتنی چەك و تفاقی جەنگی تاش بورون بوو. لەبەر ئەوەی هێزێكی زۆر لەوی مولی خوارد بوو. بۆیە كوردەكان بەمەبەستی پارچە پارچەكردنی ئەو هێرە وكردنی بەدوو بەشەوە مناوەریەكی گرنگیان كرد. بەم جۆرە هێزەكانی ئاگری فیلەكەیان سەری گرت وفەرماندەكەی ئێمەیان دووچاری وەزعێكی دژوار كرد. مدیری نا حیەی زراوتو قیوبووو هاواری یارمەتی دەكرد. بۆیە ئێمەش ئەو هێزەمان ناردە بەرەی ئارالق. لە هەمان كاتدا ئیحسان نوری هێزێكی بە فەرمماندەیەتی عومەر بەسێ ناردە تاش بورون وزیانێكی زۆریان بەهێزەكانمان گەیاند. رۆژنامەی (جمهوریەت)ی توركی دەستی بە گێرانەوەی رووداوەكانی چل ساڵ لەمەو بەر كرد. لێرەدا ئەوەندەی بۆم كرابێ متابعەی بكەم لە رووداوەكانی پەیوەندی بە كوردستانەوە هەیە دەگێرمەوە: لە ژمارەی ٢٧ / تەمموز / ١٩٣٠ رۆژنامەی جمهوریەت لەژێر ناونیشانی (كوردەكانی هەكاری نووسیویەتی: ئەو رێگرانەی كە هەمیشە لەسەر سنورو ناو خاكی ئێمەدا ئاژاوە دەنێنەوە تەمی كران. بەڵام ئەمجارە لەلای عیراقەوە ئاژاوەیان ناوەتەوە. شێخ هەرزەل

نیشتـەجێی ناوچەی موصـل. هێزێکی ٥٠٠ سوارەی ناردووەو لە ڕۆژەکانی ٢١ ـ ٢٢ ی تەمموز پەلامـاری هەکـاری یان داوە. هێـزەکـانی پاسـەوانی سنورمان ڕووبەڕوویان بوونەتەوە. زیانی گەورەیان پێ گەیاندون و. لەسنور دەریان کردون. مەبەستیان هەر چی یـەك بێت لەوکارە خۆیان لەبەردەم هێزەکانمان نەگرت و ڕووەو باشور کشانەوە. لە چیـای ئاگـری وەزع هەر وەکو پێشو بوو.صالح ئومور بەگ پاشا فەرماندەی ئەو هێزە گەورەیەی کە ئەرکی هێرش کردنە سەر ڕێگرەکانی ئاگری پێ سپێردرا بوو. دەربارەی ئەو مەسـەلەیـە ئەو ڕایگـەیـانـد: دووەمین هێرشمان پاش ماوەیەکی کەم دەست پێ دەکات ڕێگـرەکـانیش کە جار جار لە چیـا دەچنـە خوارەوە ڕووەو دەشتی ئەخـدەر زیانیان لێ دەکەویت. پاشماوەکانیان ڕاوە دوو دەنرین و هەموویاندەگـیرێن ئەوانەش کە لە چیای ئاگـری ماون و دامەزراون لە پشتەوە ئابلوقە دراون.ناتوانن ڕووەو ئێران بکشێنەوە .. شیاوی باسە ئەوی سەرۆکایەتی ڕێگرەکان لە چیای ئاگری دەکات . ئیحسان نوری پاخی بوو و ڕاکـردووە لە سوپـای ئێمـەدا. ئەو (خائینە) پێشتر لە کۆنگرەی (ڕاپەڕیوەکان) بەشداری کرد بوو. لە بەردەم (گازی ئەرزی) ی خاوەن شکو زەوی ماچ کرد (ئەو کاتە ئەو ناوەیـان بە ئەتا تورك دەووت ـ وەرگێری عەرەبی). لە کونگرەی جەنگ. ئیحسان نوری چەند مەسەلەو داواکاری یەکی پێشنیار کرد کە پەیوەندی بە کوردەوە هەبوو. کاتی زانی وەڵامی داواکاریەکانی نادرێتەوە پەیوەندی بەشاخەوە کرد. ڕێگرەکان ئەمڕۆ پێی دەڵێن (مشـیر). خەڵکی شاری بەدلیس و. خێزانەکەی تورکە. لە ژمارەی ٢٩ / تەمموز ١٩٣٠ ڕۆژنامەی (جمهوریەت) ئەمەی خوارەوە وەردەگرین : (... وەزع لە ئاگری وەکو پێشووە ڕێگرەکان کە بومبی فرۆکەکانمان هیلاکی کردون و هەموو هیوایەکی ڕزگار بوونی لێ بریون. لە توانـاشیـانـدا نەمـاوە هیچ هێرشێك بکەن. پێش چەند ڕۆژێك بەیاننامەیەکیان بڵاو کردوتەوە تیایدا هاتووە : برا کوردەکانمان. ئێوە دەتوانن ببنە گەلێکی مەزن! ئەمڕۆ هەموو گەلان بەبێ دریغی کردن لە پێناوی سەربەخۆیی خۆیاندا. خەبات دەکەن. ئەمڕۆ دەبینین گەلی کوردمان هێشتا لە ژێر باڵی چەوسانەوەی تورکە. ئایا لەمەو دوا هەر بەردەوام دەبن لەسـەر ژیـانی کویـلایـەتی ؟. خاکەکەمان زۆر فراوانە. لە ڕۆژئاواوا درێژ دەبێتەوە تا سنـوری ئێران . لە باشـورەوە تا سنوری عیراق . ئەو خاکە لە دێر زەمانەوە نیشتمانی خۆمان بووە. ئێمە ئەمڕۆ ڕاپەڕیوین و شۆڕشمان لەپێناوی دا بەرپا کردووە. پەلە بکەن و پەیوەندی بەو خەباتە پیرۆزەوە بکەن (..) ئەمە لەلایەك. لەلایەکی ترەوە. بیستمان ئەوان لە پاڵ کۆمەڵەی خۆیبون کۆمەڵەیەکی تریان دامەزراندوو. ئامانجی یەکخستنی هەموو کوردە. دیسان هەمان ڕۆژنامەلە بەرواری ٣٠ / ٧ / ١٩٣٠ ی نوسیویەتی : هەواڵنێری ڕۆژنامەی تایمز لە ئەستامبول ڕاپورتێکی بۆ ڕۆژنامەکەی نووسیوە. تیایدا دەڵێ: (هەزاران ڕێگری کورد لە چیای ئارارات خۆیان لە پوسەناوە. کوردەکانی ئێرانیش یارمەتیان دەدەن و پشتیوانیان لێ دەکەن بۆ کوژاندنەوەی ئەو شۆڕشە حکومەتی تورکیا سوپایەکی (٦٦)

سەربازان و ژاندارمیری بەرێ کردووە بۆ ناوچەکانی وان وبایەزید. ئەو هێزە سەد
فرۆکەی جەنگی پشتیوانیی لێ دەکات ئەو هێزە زۆرە بەسە بۆ
خاموش کردنی ئەو شۆرشە). حکومەتی ئێمە بە پێویستی زانی تەنسیقی سیاسی لەگەڵ ئێران بکات. بۆ ئەو مەبەستەش لە ماوەی ٤ ـ ٥ رۆژدا یاداشتێکی نارەزانیدا بە ئێران. ئەو یاداشتە وەکو ئاگادار کردنەوەو نارەزاییەکی توند بوو بۆ ئێران. لە وەڵامی یەکەمین یاداشت ئێران ووتی: پەیوەندی هاوبەشمان. پەیوەندی راستەقینە و برایانەیە. ئەوەی لە یاداشتەکەش هاتووە. ناحەقیە بەرامبەر بە ئێمە. ئێمە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندیمان بە راپەرینی ناوبراوەوە نیە لە دووەمین یاداشتمان دا هاتبوو: (پەیوەندی دۆستایەتی نێـوانمـان لەسەر هەردوو لامان پێویست دەکات. سنوری هاوبەشی نێوانمان بپارێزین چاوپۆشین لە هەندێ بۆ دزەکردن لە سنورەوە بۆ لێدانی هاوسێ. نیشانەی پێ شێل کردنی ریزو خورمەتی خەڵکانی ترە. ئەو دەولەتەی پشتیوانی لە رێگر دەکات و یارمەتیان دەدا. لە دیـدی خەڵکـانی تر ئیعتبـارو ریـزی نامێنێ. هەروەها هیچ نرخ و بایەخێکیش بۆ پەیوەندی دۆستایەتیی نێوانیان نامێنێ. ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لەسەر پشتیوانی کردن لە رێگرەکان. ئەوا ئێمە سل ناکەینەوە لە بەکار هێنانی هەموو جۆرە چەکێك کە هەمانە بۆ سەرکوت کردنی ئەو یاخی بووانەو تەنانەت راوە دووانیان لە ناو خاکی ئێرانیش). چەند رۆژێك پێش ئەمە کارەساتێکی دڵتەزێن لە ئێران رووی‌دا. کە بوو بە هۆی پارچە پارچەیی و لە ناو بردنی زۆر لە ئاگری‌یەکان. هەروەها وای کرد ئێران یارمەتی تورکیا بدات. کەبوو بە هۆی رووخانی مەڵبەندی شۆرش لە ئاگری سەردداوانەی بوون بەهۆی چنبینی ئەو رووداوە دڵتەزێنە ئەو یەکە دوای کارەساتەکەی دۆڵی زیلان. کۆمەڵە خێزانێك پەنایان بردە بەر خێلی جەلالی لە ئێران. کە چادریان لەناو خاکی تورکیا هەڵدا بوو. هۆیەی هۆزی خەڵکان بوو. کە لقێکی خێلی جەلالی بوون. لە بەرامبەر سنوری نێوان ئێران ـ تورکیـا لە ناوچـەیـەك پێـیـان دەووت ئوقـاجیـك. بە بیانوی پەرینەوەی ئەو کوردە کۆچەریانە بۆ ناو خاکی تورکیا. هێزێکی تورك پەلاماری هۆبەی ئەو هۆزەیدا. فرۆکەکانی تورك ناوچەی چالدیرانیان لە ناو خاکی ئێران بوردومان کرد. لە ئەنجامی ئەوەدا خالد ئاغا سەرۆکی خێلی جەلالی لەگەڵهەوارگەی خێلەکەی کەوتنە ژێر ئاگری تورك.

دوای ئەوەی کوردە جەلالی‌یەکان لەگەڵ هێزەکانی تورك بەیەکا هەڵچون و فرۆکەکانی تورك هۆبەکەی بوردومان کردن. دوای ئەوەی تورك هەوارگەکەیانی گرت. خالد ئاغای سەرۆك خێـلی جەلالی لەگـەڵ خێلەکـەی بە مەبەستی رزگار کردنی ژن و منداڵ و ئاژەڵەکانیان بە تایبەتیش وەرزی گەرانەوەبوو لە هەوار. بریاریان دا. بچنە دەشتی ئوفاجك: لە ئەنجامی ئەو بوردومـان و دەست دریـژی‌یە بۆ سەر خاکی ئێران. فەرماندەی ژاندارمری سنوری ئێران. نەك هەر نەجولا. بکرە فەرماندەی‌ماکو بریاری‌دا کە کەسانی ئەو خێلە لەگەڵ خێزان و ماڵ و ئاژەڵەکـانیان بگەرێنەوە ئەو شوێنەی کە تورك هێرشی کرد بووە سەرو دەست

درێژی بۆ کردبوون. بریارەکە روون نەبوو لەوەی کە ئایا مەبەست ئەومیە ئەو کەسانە لەگەڵ خێزانەکانیان تور هەڵبدەنە وەزعی مردنێکی مسوگەر یان مەبەست ئەوە بوو ئەو خەڵکانە ناچار بکەن خۆیان تەسلیمی تورکیا بکەن ! چونکە بە هیچ شێوەیەك عەقڵ ئەوەی قەبول نەدەکرد کە ئەوانە لەگەڵ خێزان و ئاژەڵەکانیان بگەڕێنەوە. چونکە بێگومان لە کاتی گۆرانەوەیان دا ئاگری دوژمن دەسوتێن . لە وەڵامی ئەو بریارە خالد ئاغا بە لێپرسراوە ئێرانیەکەی ووت: هێزەکانی تورك هاتونەتە ناو خاکی ئێران و دەستیان بەسەر بەشێکیدا گرتووە. ئێمە ئامادەی قوربانی دانین لە پێناوی پاراستنی خاکی ئێران و دەرکردنی دوژمن. ئەفسەرێك و چەند سەربازێکمان بۆ بنێرن. ئێمە ئامادەین هەموو چەکدارەکانی خۆمان بخەینە ژێر فەرمانەیتیان. بچین بەیەکەوە خاکمان لە دوژمنی ئاوەگڵ رزگار بکەین. وە لەبەر ئەوەی ئاڵای ژن و منالّ لەگەڵ خۆمان ببەینە مەیدانی شەر بۆیە خۆزگە رێگاتان دەدا چادرەکانمان لێرە بمێنێ. بەڵام فەرماندەی ماکو هەر سوور بوو لەسەر ئەو بریارەی خۆی.
بۆ رۆژی دوایی. فتح اللەخانی، رائدی یارمەتی هەر لەگەڵ چەند سوارێك کەبەشێکیان لەتورکمانەکانی ماکو بوون هاتە ناوچەی جەلالیەکان. محمد امین ئاغای برای خالد ئاغا کە سەرۆکی ئەو لقەی خێلەکەی بوو هاتە پێش وازیان. ئەفسەرەکە بەشێوەی ئەمر پێی ووت:-
- هەر ئێستا لەماکو برون. بگەڕێنەوە هەوارەکانی خۆتان لەسەر سنوور!
محمد امین وەڵامی دایەوە.
- سەربازە تورکەکان هەوارگەکەیان داگیر کردوین.
ناتوانین خێزان وئاژەلەکان لەگەڵ خۆمان ببەینەوە. بەڵام من لەگەڵ چەکدارەکانم لە ژێر دەسەڵاتی تۆین. بۆ هەر کوێ یەك ئەمر دەکەی دەرۆین .
فتح اللە ئەفسەر ووتی :
-دەبێ خێزان و منالّ و ئاژەڵەکانیش تان ببەن. ئەبێ هەر ئێستاش دەست بەرۆیشتن بکەن !
محمد امین وەڵامی دایەوە :
-بۆچی ژن و منالەکانمان رووەو بە هیلاك چوون ببەین ؟
ئێمە پیاوەکان ئامادەی رۆیشتنین.
لە ئەنجامی ئەو گفتوگویە فتح اللە دەمانچەی راکێشاو لە بەردەم هۆبەکە محمد امین ئاغای کوشت و ئیتر رکیبی لێ داو ئەوەی بەجێ هێشت و گەرایەوە.
چەکدارەکانی محمد امین ئاغاش بۆ دەرخستنی حورمەت بۆ دەولەت تەنیا گوللەیەکیشیان بە دوای فتح اللەدا نەتەقاند. بەڵکو تەنیا سوارە نانیزامیەکانیان (میلیشیا) دەسگیر کرد کە لەگەڵ ئەفسەرەکەدا بوون. دوای چەك کردنیان ئازادیان کردن.
کاتی خالد ئاغا لە سەر تەرمی براکەی ئامادە بوو. نامەیەکی بۆ فەرماندەی ناوچەی ماکو

نووسی تیایدا هاتبوو. براکەم کوژرا. بەڵام با قوربانی شاهینشا بێت لە بەر ئەوەی وەرزەکە وەرزی پایزە بۆیە خێڵەکە دەگەرێتەوە شوێنەکانی خۆی. هیوادارم رێگایان پێ نەگرن! شەو دەستیان بە گواستنەوە کرد. رێگای زستانەیان گرتە بەر (کارێکی ئاشکرایە کە خێڵە کوچەرییەکان. شەو دەگوازنەوە بۆ هەوارگەکانیان و دەگەرێنەوە. پیاوەکانیش بەروار ئاگاداری ئاژەڵەکان دەبن - نوۆسەر) تاریکی شەو مابوو گەیشتنە دەورو بەری ناوچەی گاجووت. رەبیە سەربازییەکەی ئەوی هەستی پێ کردن. خۆیان و خێزانەکانیان گەللە باران کردن. چەکدارەکانی خێلەکەش هێرشیان کردنە سەرو هەموو سەربازو ئەفسەرەکانیان دەسگیر کرد و چەکیان کردن. بەمەش رێگایان لە بەردەم خۆیان ئاواڵە کرد.

فتح الله خان بەو کارە سوکەی خۆی. خزمەتێکی گەورەی حکومەتی تورکی کرد.

رۆژی پاشتر هەواڵی ئەو رووداوە گەیشتە ئاگری. لە پێناوی تێ گەیشتن لەو هەڵوێستە سەختەو چارەسەر کردنی ئەو مەسەلە ئاڵوزە لێپرسراوی کورد لەگەڵ دەستەیەك لە فەرماندەکانی ئاگری چوونە سەردانی خێلی جەلالی. کاتی گەیشتن ئەفسەرو سەربازەکانیان ئازاد کرد کە کوردەکان دەسگیریان کرد بوون و لەگەڵ خۆیان هێنا بوویانن. چەکەکانیان دانەوەو رەوانەی ماکویان کردنەوە. بە مەبەستی کوژاندنەوەی ئاگری ئەو ئاژاوەیە لێپرسراوی کورد نامەیەکی بۆ ژەنەراڵ حسن خان مقدم نووسی. تیایدا دەڵێ: هەر چارەسەرێك کە دەولەت دەیدۆزێتەوە. هەر بریارێك کە دەربارەی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە دەدرێت. لە لای ئێمە زۆر بەووردی جێ بەجێ دەکرێت. فەرماندەی سوپا. ژەنەراڵ حسن خان ئەفسەرێکی بە ناوی ئاگالاروف ناردە لای فەرماندەی کورد. دەربارەی مەسەلەکە قسەیان کرد. ئاگالاروف ووتی: موسی ئیبراهیم سەرۆکی خێلی ساکی ئاگاداری کردینەتەوەو دەڵێ: سوارەکانی ئاگری خۆیان ئامادە کردووە هێرش بکەنە سەر سنووری ئێران! موسی ئیبراهیم، خۆیو خێزان و خزمەکانی لەسەر گردی ئایبەی بەرامبەر سنوری ئیران چادریان هەلدا بوو. گوایە موسی ئیبراهیم ناچار کرابوو لە رێگای یوسف خان. نائبی سەرۆکی مەڵبەندی سنور لە ئایبە ئەو راپورتە بنوسی.

ئەفسەری پەیوەندی نێوانیان تورکمان بوو. دەسەلاتەکانی خۆی بەسەرۆکەکەی فتح الله خانی یاریدەدەر وەردەگرت. وەکو هەوڵێك بو سەرکەوتنی پیلانەکەی. بەڵام فەرماندەی سوپا. دوای لێکۆڵینەوەیەکی پێویست. وە بە پشتیوانی تاقیکردنەوە زۆرەکانی. کە هی چەند ساڵێك بوو. ئامانج و داواکاریەکانی ئاگری باش دەزانی بۆیە رای گەیاند:

مەسەلەکە هی بروا پێ کردن نیە' هەرگیز ناکرێ ئیحسان نوری کاری لەو بابەتە ئەنجام بدا!

بە مەبەستی دروست کردنی زەمینەی بروا لای دەولەتی ئیران. خالد ئاغامان لە سەرۆکی خێلی جەلالی لابردو ئامۆ ئاغای کوردیان لە شوین دانا، بە مەبەستی نیاز پاکی ئامو ئاغاش. مستەفای برای و حسن خالدی کوری مامی ناردە بەردەم فەرماندەی سوپا لە ماکو. ئەویش مستەفای لەگەڵ خۆی برد تەبریز. دواتر گەراندیەوە

ماکو لە کاتی گەرانەوەدا بەگەرمی پێشوازی لێ کراو ریزیان لێ نا. ئەمەش وەکو هەنگاوێکی ئیجابی بوو دەربارەی هەڵوێستی دەولەت بەرامبەریان.
خالد ئاغا چەند برادەرێکی لە شاری ماکو هەبوو. ریزیان لێ دەگرت وریزی لێ دەگرتن. هەر هەمان رۆژ یەکێکیان ئاگاداری مستەفای کوری خالد ئاغای کردەوەو ووتی :ئەمشەو سوپا لەگەڵ هەندێ لە میلیشیا ئابلوقەی چادری باوکت دەدەن. بەزیندویتی یان مردوویتی دەیگرن. یا الله هەر ئێستا برۆ ئاگاداری بکەوە.
مستەفا بە پەلە ماکوی جێهێشت و رووەو هەوارگەی باوکی کەوتە رێ. کاتی گەیشت نەخشەی فەرماندەی سوپای بۆ باوکی باس کرد. ئەویش بە پێی ئەو هەواڵە هەوارگەی خۆیان کوری هەندێ لە شوێنی ئەصلی خۆیان دوور کەوتنەوە. چونکە بروای تەواوی بەو ئاگاداری‌یەی برادەرەکەی هەبوو. بەلام حەسویی ئەیوب ئامۆزای خالد ئاغا کە هەوارگەکەی لە نزیك ئەخدەر بوو. لە شوێنی خۆی نەجولا. چونکە بروای بەو هەواڵە نەکرد. ئەوەی برادەرەکەی خالد ئاغا ووتی هاتە دی. کۆمەڵێك لە هێزەکانی حکومەت کە پێك هاتبوو لە سەربازومیلیشیا (ئەوانە سەربازی نیزامی نەبوون بەڵکو کەسانێك بوون بە ئارەزووی خۆیان چەکیان هەڵگرتبوو و شەریان بۆ حکومەت دەکرد ) دەیان ویست ئابلوقەی هوبەی خالد ئاغا بدەن. بەلام لە پر زانیان کە هوبەکە چوڵ کراوە. زیاتر چوونە پێشەوە رێکەوتی چادری حەسویی ئەیوب یان کرد ئابلوقەیان دا. لەگەڵ کازیوەی بەیانی. کاتی حەسویی ئەیوب گاگەڵ و ئاژەڵی رادەدا. تەقەیان لێ کردو کوشتیان رەشماڵەکەشیان دایە بەر گوللەو ژنەکەیان کوشت. مەر لەوەرینەکان و هەندێ کەسی‌کە لە هۆبە بوون. تەقەیان لە سەربازەکان کردەوە. لەگەڵ بیستنی دەنگی تفەنگ کۆمەڵێك لە سوارەکانی کورد هاتنە ئەوێ و بەشداری شەرەکەیان کرد. هێزەکانی حکومەت تێك شکاو کوردەکان دوایان کەتن. زیانێکی زۆریان پێ گەیاندی بە تایبەتی بە میلیشیاکان.
سەرۆکەکانی ئاگری جارێکی تریش جلەوی مەسەلەکەیان گرتەوە دەست. پێشرەوی کردنی خێڵی خەلکانیان راگرت. وەلائیان بو دەولەتی ئیران پێ مسوگەر کردنەوە. بەلام دەیان ووت پەیوەندی‌یان لەگەڵ دەولەت بێ بروایییەکی لێ دروست بوو بوو. چونکە لێیان دلنیا نەبوون. ئەو هەموو رووداوە،کە کورد هیچ دەورێکی نەبوو لە دروست کردنیان. نازانم هەواڵەکان چۆن دەگەیشتە دەولەت. ئیتر دەولەتی شاهنشا هی هەموو کوردی لە بەر چاو بوو بوو بە رێگر. ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی شالایەنی تورك بگرێت و یارمەتیان بدات بۆ لە ناو بردنی کوردو سەرکوت کردنی شۆرشی ئاگری. هەر وەکو پێشتر باسم کرد. ئیحتمالێکی گەورە هەیە کە ئەو هەڵویستەی دەولەت ئەنجامی ئەو درۆو پیلانە بوو بێت کە فتح الله تورکمانی‌یاریدەدەر لە راپورتەکەی دا دروستی کرد بوو کە خزمایەتی ژن و ژن خوازی هەبوو لەگەڵ خێزانی حاکمی ماکو. ئەگەر مەسەلەکەی وا بوو بێت. زۆر نارەوا بوو کە هەڵویستی ئیجابی چوار ساڵەی ئاگری‌یەکان بەرامبەر بە دەولەتی ئیران فەراموش

بکەن. هەق بوو هێندە خۆیان ئەزیەت بدەن و بیربکەنەوە کە پێشتر فەرماندەی کوردیش ئەم رووداوە. گەلی گیروگرفت و کوسپی لە بەردەم دەولەتی شاهنشا هی چارسەر کرد بوو. بەداخەوە هەندێ لە تورکمانەکانی ئازربایجان بنەچەو نەژادی خۆیان نازانن! ئەگەر خۆیان هیلاك بکەن و بگەرێن. مێژووی کۆنی ئێران بخوێننەوە. ئەوا باش دەزانن کە پێش هاتنی مەغول و فەرماندە تورکەکان. زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئێرانی بوون لە نیشتمانی باوو باپیرانیان کۆچیان نەکردو بۆ هیچ ناوچەیەکی تر نەچوون. لە ئەنجامی چەندین ساڵ و جەوری دەسەلاّت دارە تورکەکان. ناچار بوون ـ لەترسانا ـ زمانی تورکی فێربن. زمانی باوو باپیرانی ئێرانی خۆیان لەبیر کردووە. ئەمرۆ خۆیان بە تورك ئەزانن و عەتفیان لەگەڵ دەولەتی تورکیا هەیە. ئەوان بەوە نکولی لەگەڵ و بنەچەی راستی خۆیان دەکەن. بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا ئەمرۆ کەسانێکی خوێندەواری زۆر هەیە لە نێوانیان دا. کە بنەچەو نەژادی خۆیان دەزانن.

ئاوارەکانی دۆلی زیلان هاتنە چیای ئاگریئەمەش مانای ئەوەیە ژن و منالّیکی زۆر هاتنە ئاگری. گرفتێکی زۆر لە ئازوقە پەیدا بوو. لەو شەوە درێژخایەنەدا پێشمەرگەکان پشتیان بەو چەك و تفاقە جەنگییە بەستبوو کە لە دوژمنیان دەگرت. بەلاّم ئازوقە بەشی نەدەکردن. لە هیچ لایەکیشەوە یارمەتیمان بۆ نەدەهات. لە هوبەی لەزگین سلو. گەورەترین سەرۆکی ساکی. کە رەشمالەکەی لەسەر ئاگری هەلّدا بوو. لە کانییەك ئاویان دەهێنا کە لەوێ بوو. بەلاّم کاتی ئاوارەکانی دۆلی زیلان گەیشتن ئاوی ئەو کانیە کەمی کردو بەرەو وشك بوون چوو . کە پێشتر ئاوی زۆر لێ هەلّدەقولا. خوا دەزانی تەمەنی ئەو کانیە چەند هەزار ساڵ بوو. کەس نازانی شەو ئەو هەموو ئاوە چووە کوێ ؟!.

## دوا هێرش

فرۆکەکانی تورك هەمیشە لەئاسمانی ئاگری دەسورانەوەو بورکانی بۆمبە سوتێنەرەکانی خۆیان بەسەر سەری دانیشتوانی ئاگری دادەباراند. کوردەکانیش جارجارە بەتفەنگەکانیان رووبەروویان دەبوونەوەو نەیان دەهێشت بەسەلامەتی بگەرێنەوە بنکەکانی خۆیان جارێکیان یەك لەو فرۆکانە بو خۆی زۆر بلّند فری، خۆی گەیاندە بەرزترین دوند. ئەو سرمبایەی کەتا ئەمرۆ لەچاوی ئادەمی (مرۆڤ)خوی شاردبوەوە ئەمرۆنە دەبوو ئاگری رێگەی دوژمنی لاوانی. خۆیردا، بەو شێوەیە بی ترس بەرز هەلّفری وسەری بەرز بی. بۆیە مستێکی بەهێزی بای ئاگری. دای لەفرۆکەکەو لە ناوچەی ئارالق خستیە خواردوە.

کاتی ئەوە هات مالئاوایی لەدوندەکان بکەین وبکەرێینەوە باوەشی دۆلەکان. رەشمالی ئاگرییەکان هەندی هاتنە خوارەوە. نادر بەکی کورد نازاو جەسوری حسین پاشا لەگەڵ

سوارەکـانی. بو دابـین کردنی ئازووقە رۆیشتن. لێرەدا پێویستە لەسەرمێلێم کورەکانی حسین پاشا مەموو نارد، تەواو بەپێچەوانەی باوکیان بون، بەهەموو تواناو دڵسۆزی و لەخۆ بوردنەوە لە پێناوی گەلەکەیان خەباتیان دەکرد، هەر بۆیەش هەردووکیان جێگای رێزو تەقدیر بوون لەلایەن سەرجەم نیشتمانپەروەرانەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم کە ئەگەر چی حسین پاشا سەرباری هەموو گوناهو تاوانەکانی چ بەقسـەو چ بەکـردەوە دژی گەلەکـەی بوو. بەڵام نیشتمـانپـەروەران کاتی خۆی بەرووداوی کوژرانی حسین پاش نارەحەت بوون. بەرامبەر بەوەش (مدنی) بکوژیشیان. کە کـوری حەجی موسی بەگی سەروکی ناوچەی موش بوو. بەتاوانبارو خائین لە قەلەم دا، ئەگەر چی هەندێ هەلویستی نیشتمانیشی هەبوو.

حاکمی ماکو ئەو زەمینەیەی بروای نەهێنشت کە ئاگری‌یەکان بەرامبەر خۆی و دەوڵەتی ئێران هەیان بوو. ئاگالاردقی ملازمی یەکەمی نارده سنوری ئاگری. بۆ ئەوەی بەفارماندەی کورد بلیت کە ئاگـری‌یـەکـان دەتـوانن کاروانێـك بنـێرن بۆ ماکـو. بۆ ئەو شتانەی پیویستیانە، لە رۆژی گەیشتنی ئەو کاروانە بۆماکو بالیـوزی سۆفیەت کاروانەکەی بینی بوو. تورکەکانی ئاگادار کردبووە لە راستی دا ئەگەر ئەو پیشنیارەی حاکمی ماکو لە دلیکی پاکەوە بهاتایە. ئەوا یارمەتیەکی گەورە بوو بۆ ئاگری‌یەکان. بەڵام بەداخەوە مەسەلەکە لە فێڵ وپیلان زیاتر نەبوو. مەبەست لەو پێشنیارە کەم کردنەوەی قەوارەی هێزە پارێزەرەکانی بوو. بۆ ئەوەی ئیتر تورك بتوانن دەستیان لێ بوەشێنن.

هەر وەکـو لەلاپەرەکانی پێشوو باسم کرد، ئاگری‌یەکان خۆیان بەنەژادی‌ئاری ئێرانی دەزانی. بۆیە هەرگیز بەبیریان دانە دەهات کە رۆژێك دا دێت ئێران دژیان دەوەستێ. هەر ئەو بروایەش بوو وای کرد، بەخۆشی‌یەوە پێشنیارەکەی حاکمی ماکو پەسند بکەن.

کاروانێکی گەورەیان رێك خست و رەوانەی ماکو یان کرد. بەڵام بەداخەوە ئاگری‌یەکان دوای ئەوە جارێکی تر ئەو کاروانـەیـان نەبینی‌یەوە. چونکە رۆژێك پاش بەرێ کردنی کاروانـەکـە. هێـزێکی گەورەی سوپـای تورك کەپێك‌هاتبوولە سی و سێ هەزار سەرباز. بەپیشتوانی چەکی قورس و فرۆکەی‌جەنگی تازە گەورەترین هێرشیان کردە سەر بنکەی ئاگری.

ئێرانیش زەمینی ژێر دەسەڵاتی خۆی. کە دەکەوتە پشتی ئاگری. خستیە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی تورك. بۆ ئەوەی بتوانن کوردەکان تێك بشکێنن. بەم جۆرە دەرکەوت حاکمی ماکو فێڵی لە فەرماندەی کورد کرد. وناهەقی لەگەڵ کرد. لەبری ئەوەی رێگایان بدات لە خاکی ژێر دەسەڵاتی ئێران بە ئازادی بگەرین. خستیە ژێر دەسەڵاتی سوپای تورك. نەك هەر ئەوەش: بەڵکـو کۆمـەڵێـك لە هێـزە چەکـدارەکانی لەگەڵ ئەسپەکانیان دوور خستەوە بۆ ئێران. بەبیانوی هێنانی پێویستی لە ماکو ئەو هێزەی لە ناوچەکە دوور خستەوە. هەروەها ئێران لە سنوری بەرامبەر ئاگری کشایەوە. لەلایەکی تریشەوە حاکمی ماکو پەیوەندی بە خێلی

قزلباش ىوغلوى كورد كرد. كه چەند ساڵێك پێشتر لە ئەنجامى شەرى ئازادى دا روويان كرد بووە توركيا. ئەو خێڵە پارێزگارى ناوچەى سەرووى رۆژهەڵاتى ئاگرى وسەردار بولاخى پێسپێردرا بوو حاكمى ماكو پەيوەندى بەو خێڵە كردوەو هانى دان بۆ گەڕانەوە بۆ ناو خاكى ئێران. بەڵهێنیش بەلینى لى بوردنى پێدابوون. لەم كاتەش دا حكومەتى تورك جورەها فێڵ وپیلانى دەگێرا. چ لەرێگاى توقاندن وچ لەرێگاى فێڵ بێت بۆ دوور خستنەوەى تێكۆشەرەكانى ئاگرى لەلانەى خۆيان و. خستنە ژێر فەرمانى خۆيەوە. لەئەنجامى ئەو كوششەى دا. بەشێوەیەكى زۆر تەركیزى كرد بووە سەر پەنابەرەكانى خێڵى حەیدەرى.

نامەمان ئاراستەى برو هەسكى و شێخ عبدالقادر كرد. لە نامەكانیان داهاتبوو كە حكومەت عەفوى كردون. پێشنیارى ئەوە دەكات كەچەكدارەكانى جەلالى وحەیدەران بگەرێنەوە گوندەكانى خۆيان.

پێشمەرگە كوردەكان برسێتى وسەختى ژيان، تەنانەت مردنيان لەژێر ئالاى شەكاوەى گەلەكەيان لاخۆشتر بوو لەوەى بگەرێنەوە ولەژێر دەسەڵاتى تورك بژين، ئەمەش خۆى لە خۆى‌دا بەڵگەيەك بوو بو سەرنەگرتنى پێشنيارو بەڵێنەكانى حكومەت.

لەنێو هەمو شۆرشگێرەكانى ئاگرى چیا لە حەسەن ئاغاى حەیدەرى وبايەزيد ئاغاى كورى كەسێكى تر تەسليمى توركيا نەبۆوە. لەگەڵ ئەوەش دا پێشمەرگەكانى خێلى حەیدەرى رێگايان لە حەسەن ئاغاو كورەكەى گرت و ويستيانبيان كوژن. بەڵام سەرۆكەكانى ئاگرى مەسەلەكەيان چارەسەر كردو نەيان هێشت ئازارى ئەو پياوە پيرە بدەن. دواى كارەساتى ئاگرى بۆمان دەركەوت كە توركەكان بەشێوەیەكى ئەوتۆ ئەشكەنجەى ئەو پياوە پيرميان دابوو بەرگەى ئەو ئازارەى نەگرتبوو ولەئەنجام دا گيانى دەرچوو بوو.

هێرشەيەك لەدواى يەكەكان بو سەر ئاگرى دەستى پێكرد تيپە سەربازىيەكانى تورك بەهەنگاو دەهاتنە پێشەوەو ئابلوقەى دەوريان لێ بچوكتر دەكردينەوە. ئاگرى يەكان لەسنورى پشتەوەى خۆيان دڵنيا بوون پێيان وابوو سنورى ئێران ناوچەيەكى بى لايەن وسەلامەتە. بۆيە ژن وماڵ ومناڵ و ئاژەلەكانيان ناردە ئەو ناوچەيە. ئيتر پێشمەرگەكان دەستيان ئاوە لەبوو بو لەروو وەستانەوەى هێرشەكانى تورك وبەرپەرچ دانەوەيان.

هەر وەكو پێشو تريش چەندين جار كردبوويان. ئەمجارەش جلەويان بو هێزەكانى تورك شل كرد كە بگەنە مەڵبەندى ئاگرى وهيلاكيان بكەن. هێزەكانيان لە نێوان تاوير ودول پەناگەكان پارچە پارچە وبڵاوە پێ بكەن. ژمارەيەك لەفرۆكەكانى دوژمنيش بەئاسمانى ئاگرىيەوە بوون. ژن ومناڵە بى تاوانەكانيان بۆمباباران دەكرد. كاتى ئەو كۆمەڵە فرۆكەيە دەرويشتن يەكسەر كۆمەڵێكى تر شوێنيان دەگرتنەوە. بۆ بۆمباران كردنى ناوچەكە بروهەسكى و هەندێ لەچەكدارەكانى هۆزى هەسەسورى لەبەرەى راست لەلاى رۆژئاوا دەيان پاراستين بروهەسكى وەكو سنگ لەخاك جەنگى بوو. هێرشەيەك لەدواى يەكەكانى

تورك نەیان دەتوانی بای نوكی دەرزی لەشوێنی خۆی بیجولێنن! تەنیا دەبووە هۆی بی دەنگ كردنی تفەنگی دەستی بروا!.

لەدووەمین رۆژدا هەموو لایەكان رازی بوون لەسەرەنجامی شەرەكەدا. لەسێیەمین رۆژدا پێشمەرگەكانی ئاگری پشتیان كرد. شاخە مێژووییە دێرینەكەی چیای ئاگری. سووربوون. لەسەر دروست كردنی داستانی بێوێنە لەمەیدانی شەردا. لەراستیش دا شەرێكی خوێناوی سەختیان كرد كە لەمێژوودا وێنەی كەم بوو. هەر لەم كاتەدا دەنگی تۆپ و تفەنگ ورەشاش ومەترلوز لەلای مەڵبەندی سنووری ئێران. لەناوچەی ئایبەی دەستی پێكردو. بەردەوام بوو سەرەنجامی ئەو تەقەیە تەئسیری زۆری كردە سەر پێشمەرگەكانی ئاگری ونارەحەتی كردن. لە هەڵوێستێكی دژوار دابوون. نە دەكرا بەو شێوەیە بەرپەرچی ئاگری سوپای ئێران بدەنەوە. فەرماندەی كورد پێی وابوو مەسەلەكە لەئەنجامی گرفتێكی بچوك‌و لەیەك نەگەیشتن بووە‌بۆیە خۆی رووەو ناوچەی تەقەكان چوو بەنیازی ئەوەی گیروگرفتەكە چارەسەربكات. فەرمانی دا وەلامی تەقەی سوپای ئێران نەدرێتەوە.

بەڵام كاتێ گەیشتە مەلبەندە سنوورییەكە لەپرو بەبێ ئەوەی چاوەروانی بكات. كۆمەڵێك لە هێزەكانی توركی بەدی كرد. كەلەناو خاكی ئێران دامەزرابوون و سەنگەریان گرتبوو لە پشتەوە پەلاماری هێزەكانی كوردیان دەدا، بەبێ گومان ئاشكرا بوو كە دەوڵەتی ئێران لەسەر داواكاری دەوڵەتی تورك. رێگای بە هێزەكانی تورك داوە لەو ناوچەیە كەدەكەوتە پشتی ئاگری بە ئازادی بجولێنەوە. ئەمەش بەمەبەستی ئەوەبوو دەست بخەنە بینە قاقای مەلبەندی شۆرشی كورد. نووسەر لێرەدا داخ وگلەیی ئاگرییەكان دەردەبریت لەبەرامبەر ئەو هەلویستە سلبییەی ئێران ئاگرییەكان خۆیان بەرەگەزێكی كونی نەژادی ئاری ئێران دەزانی بەدرێژایی ساڵەكانی راپەرینەكانیان دژی توركیا. پەیوەندی هاوسیەتی و دوستایەتی باشیان هەبوو لەگەڵ دەوڵەتی شاهنشای ئێران. هیچ رۆژێكیش پەیوەندی ئیجابی ئەو هاوسیەتیەیان نەژاكاند ئەگەر من هەقم بێ یان نا. گلەیی و ئەو زوڵەی لیمان كرا دەخەمە بەرچاوی روشنبیرو نیشتمانپەروەرە ئێرانیەكان.

رۆژگاری شووم كاری خۆی كرد. وەزعی كورد لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەرۆیشت. پاراستنی ئەو مەیدانی شەرە درێژو فراوانە. بەو ژمارە كەمەی پێشمەرگە كارێكی هەرگیز لە كردن نەهاتوو بوو. بۆیە ناچار كران بكشێنەوە لوتكەی چیای ئاگری. بگرە پاشماوەی ئەو رۆژەیان لەوێ بەسەر برد. لە چوارەمین رۆژی شەردا پێشمەرگەكان هەموو بستێكی خاكی نیشتمانیان بە خوێنی خۆیان ئاودا. نەیان هێشت هیچ شوێنێك هەروا بە ئاسانی بكەوێتە دەست دوژمن. شەرێكی سەخت و خوێناوییان لەگەڵ دوژمن كرد. شەرێكی ئەوتو كە كوردەكان ژەنەراڵ صالح پاشایان ناچار كرد داوای هێزی زیاتر بكات لە فەرماندەی گشتی هێزە چەكدارەكانی توركیا.

بۆ ئەوەی ئەو کەلە بەرانە پڕ بکاتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکانی لە کاتی شەڕدا کوژرا بوون. بۆ ئەوەی لە لایەکی تریشەوە بەر لە هێرشیتوندی کوردەکان بگرێت. لە دوایین رۆژی شەڕەکاندا کۆمەڵێک لەو هێزانەی بۆ پاڵپشتی دوژمن هاتبوو کەوتنە دەست کوردە شۆڕشگێڕەکان. پێشتر دەمانزانی کە بڕیار بوو ئەو هێزە شەوانەو کاتی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە ناوچەی باشقە لەوەبین تا دەگەنە ئاگری. بە پێچەوانەی ئەوەوە. کوردەکان هیچ هیوایەکیان بە هیچ یارمەتیەك نەبوو. لە هیچ لایەکەوە. هەر وەکو پێشتریش لە زمانی یەکی لە رۆژنامە تورکیەکان گێرامەوە کە دەوڵەتی تورك لە هەوڵیدا بۆ سەرکوت کردنی شۆڕشی کورد سوپایەکی گەورەی ٦٦ هەزار سەربازو ژەندرمەی. بە پاڵپشتی سەد فرۆکە. نارد بووە سەر شوڕشگێڕە کوردەکان. چیای ئاگری بەشی شێری لەو هێزانە بەرکەوتبوو. پاشماوەی تری هێزەکە کاری ئەوەیان پێ سپێردرا بوو کە رێگای یارمەتی لە ئاگرییەکان بگرێت کە لە لایەن کوردەکانەوە بۆیان دێت. جا ئەو کوردانە چ کوردی تورکیا یان کوردی ئێران بن. بەم جۆرە هۆبەی موسی ئیبراهیم ساکی. کە لەسەر گردولکەکانی ئایبەی بەرامبەر مەڵبەندی سنوری ئێران بوو. کەوتە بەر تۆپ بارانی تورك و کۆمەڵێکیان لێ کوژرا .دیمەنێکی زۆر ناخۆش بوو کە دەت بینی ژن و منال لە ترسی ئاگری تۆپ و تفەنگی دوژمن بە هاوار و بێ ئومێد را دەکەن و شەپۆلی مردنیش لە هەموو لایەکەوە دەوری گرتبوون. ژنان دەگریان و لە مێردەکانیان دەپارانەوە کە بە دەستی خۆیان بیان کوژن نەهێڵن خۆیان و منالەکانیان بکەونە دەستی دوژمن.

ئابلوقەی دەورمان هێندە توند بوو دوژمن دەیتوانی لە هەر شوێنێك بیەوێت بە ئاسانی ئاگری چەکەکانی خەست بکاتەوەو تەرکیز بکات. کارەساتەکەی ئێمە لە کارەساتی کەربەلا دەچوو. بەڵام جیاوازییەکیان لە نێوان دابوو. عەرەبە هێرش کەرەکان ئەو کاتە دەستیان بۆ ژن و منال درێژ نە دەکرد. بەڵام تورکە هێرش کەرەکان بەرمی سەر تفەنگەکانیان سکی ئافرەتی سك پڕیان هەڵدەدری. بەنوکی رمەکانیان منالیان لە سکی دایکان دەردەهێناو دووریان فرە دەدا. هەر وەکو لەگەڵ شەکری ژنی دیوانە (برازای برو هەسکی) و چەند ژنێکی تر ئەنجامیان دا کە کەوتنە دەست تورك. ئەمەش باشترین نموونەیە بۆ ئەوەی کە ووتمان.

مەسەلەی شەرەف و ناموس پیاوەکانی ئاگری ناچار کرد دەست بەرداری بڕیارەکانی پێشووی خۆیان بن. و ژن و منالەکانیان نەخەنە بەر رەحمەتی بێ رەحمی دوژمن. هەر لەم روانگەیەوە کۆمەڵێك لە چەکدارەکانی خێلی حەیدەری و کلتوری لە لای اشکەندەوە هێرشیان کردە سەر هێزەکانی تورك و . ناچاریان کردن بکشێنەوە دواوە. لەو هێرشەدا هێزە پارێزەرەکانی کورد لە ئەلقەی ئابلوقەکە نزیك بوونە. لەگەڵ کەوتنی هەتاو مەڕو ماڵات و ئاژەڵەکانیان جێ هێشت. ژن و منالەکانیان لەگەڵ خۆیان بردو توانیان لە دوو شوێن

ئابلوقەی دوژمن بشکێنن. بۆ نیوەڕوی ڕۆژی دواتر بەتەواوی لە ئابلوقەکە چوونە دەرەوە.
ئیحسـان نوری لەگـەڵ ئەو کومەڵەدا بوو. لە کاتی کشانەوەی ئەو کۆمەڵە ژمارەیەك لە هێزەکانی دوژمن بە دیلی کەوتنە دەست کوردەکان. کۆمەڵەی دووەم لە هێزەکانی پارێزگاری کورد نەیان توانی ئابلوقەکە بشکێنن. بۆیە بە بهێنی لە دولی (ئاخوریك) مانەوە. شەوی دواتـر توانیـان بپـەڕنەوە. برو هەسکی لەگەڵ کۆمەڵەی دووەم دا بوو. ڕەشویی سلو. سەرۆکی ئازای خێـلی بەکـران لەگەڵ پیاوەکانی خسوی وبە هاوڕێیەتی سەید ڕەسول و هەندی لە پیاوەکانی ڕووەو ناوچەی ئەخدەری ناحیەی قورخان بەری کەوتن ڕەشویی سلۆ لەگـەڵ
پیـاوەکـانی ماوەیەك لە دۆلی زیلان مانەوە هێزەکانی تورك چەندین جارپەلاماریان دان بەلام هەمـوو جارەکـان دەشکـان، جارێك لە هێرشکی دوژمن ڕەشویی سلۆ کوژرا، بەلام سید ڕەسـول
لەگەل هەندێ لە پیاوەکانی ماوەی چەند ڕۆژێك لە لوتکەی شاخ لە نزیك بایەزید مانەوە. تا لە ئەنجامی برسێتی هاتنە خوارەوە. سەرەنجام ئەویش لە لایەن هێزەکانی تورك دیل کراو کوژرا .بەم جۆرە ئاگری. کە ناوەندی ئازادی کورد بوو. کەوتە دەست دوژمن. ئیتر تورك دەستیان بە پیادەکردنی سیاسەتی کوشتنی کوردو لە ناو بردنیان کرد. محوی تەمر. سەرکـردەیـەکی ئادنی بوو. پیاوێکی بە.سالا چوو و نەخۆش بوو. لە ئەنجامی پیری و نەخۆشی نەیدەتوانی بەرێکادا بڕوات. پاش گرتنی ئەرجیش لە لایەن دوژمنەوە. بە هەزار ناری عەلی توانی بگاتە ئاگری. ئیتر لەوێ مایەوە. عەلی کۆیی هەسنی. کە لە ئەنجامی بێ هۆشی عەمەلیان کردن. هەر بێ هۆش بوو. لەگەڵ هەندێ پیروپەك کەوتەی تر لێرەو لەوێ هەر لە ئاگری مانەوە. هەموو ئەوانە لەلایەن تورك بەدیل گیران. چەستەی پیرو نەخۆشی ئەوانە بە نو کەرەمی سەربازە تورکەکان پارچە پارچە کران. ژنی عەلیکو. کە هاورێی ڕێکای بوو. ژنێکی گەنـج و تەنـدروستی باش بوو. وە بەهـۆی ئەوەی دڵسوزو وەفادار بوو پیـاوەکـەی. بۆیـە لە کاتی لێ قەومانا جێ نەهێشت. بەخۆی و کچە بچوکەکەی لەلای مانەوە. کچەکەی تریش کە ژنی فەرزەندە بەگ بوو. ئەویش گەرایەوە لای دایك و باوکی. ئەمـانـەش هەر چواریـان بوونـە جێنیشانی ڕمی تورکەکان گیانیان لە قولایی ئاسمان دەستیان لە ملی یەکتر کرد. ئەمە بەڵگەی دڵسوزی و وەفایە لە ناو خێزانی کوردەواری دا.
دوای داگـیر کردنی ئاگـری (٢٧) کەس لە ژن و منـاڵی خێزانەکانی ئەحمەد حەجی برو حەیدەری و براکانی. کە لە جەنگاوەرە ناسراوەکانی ئاگری بوون. لە نزیك سنوری ئێران لە ناوچەیەك پێی دەووترێ سەری کانی بەدیل گیران. هەموو ئەو بێ تاوان و بێ چەکانە گوللە باران کران. ماوەیەکیش لاشەکانیان لەو ناوچەیە مابووەوە.ئەحمەد حەجی برو برای صاق پاشا بوو کە لە دواین شەری ئاگری کوژرا. لەگەڵ هەردوو براکەی تری ئەرسەلان و

عەبـدوللا. بە نیازی دەرباز کردنی خێزانەکانیان هاتن. کاتی گەیشتنە شوێنی مەبەست بەسەر لاشەی ژن و منالە بێ تاوانەکانیان دا کەوتن کە لە گۆمی خوێن دەگەوزین.ئەو قەسـابخـانە ترسناکە تەئسیرێکی زۆری کردە سەر دەروونیان.نەیان هێشت ئەو تاوانە بەبێ تۆڵە سەندەوە بروات. بەڵام ئەو تۆڵە سەندنەوەیە هەر تەنیا هاندەرێکی شەخسی رووت نەبوو. ئەو خێزانە نیشتمانپەروەرە بە خەباتگێرو تێکۆشەر ناسرا بوون بەمەش ئازایـەتی و سەروەری‌یـەکی تریان خستنە سەر سەروەری‌یەکانی پێشویـان. بەم جۆرە ئەحمەدو هەر دوو براکەی عەبدوللا و ئەرسەلان. بێ دەست پاراستن شەری تورکیان کرد. تا هەرسێکیان شەهید بوون و گەیشتنە کاروانی شەهیدانی ئازادی. لە کاتی شەرەکانی ئاگری فەرماندەی تورک هێلی لە خالد ئاغا سەرۆکی خێلی جەلالی‌کرد لە ئێران. کە دەردی سەری‌یـەکی زۆری بە دەستی حاکمی ماکو چێشتبوو. فەرماندەی تورک داوای لە خالد ئاغـاو خێلەکـەی کرد بگـەرێنـەوە تورکیا. دوای داگیر کردنی ئاگری. وە لە ترسی تۆڵە سەنـدنـەوەی حکومەتی ئێران. خێلی خەلکان لەگەڵ خێلی جەلالی کە هەردووکیان ئێرانی بوون چوونە ناو خاکی تورکیا. ئێرانی نیشتمانی خۆیان بەجێ هێشت. زوهدی کویفن دەربارەی ئەو مەسەلەیە دەنووسێت و دەڵێت : لە سەرەتادا. وە بەتایبەت لە مانگی ئاب. دەهاتە بیستن کە سەرۆك خێلی خەلکان لە ئێران. خالد ئاغا. دوو چاری ناکۆکی‌یەکی توندو ناخۆش بوو لەگەڵ هێزەکانی ئێران و. ماوەیەکی خایاند. کە زیاتر لە سەد کوژراو بوو رووی کردە چیای ئاپە. لەو کاتەدا ئەفسەری سنوری سۆڤیەتی هەواڵێکی بۆ ئەفسەری سنوری ئێمە ناردو دەڵێت ـ لەو رۆژانەدا چوار سەد خێزانی خێلی خەلکان لە ناوچەی دیل ـ ئارالق لە سنور بەرەو تورکیا پەرینەوە.

ژمـارەی چەکـدارەکانی ئەو خێلە نزیکەی (٨٠٠) چەکدار بوون. بوونی ئەو هەموو کەسەش لەو ناوچەیەدا. جێگای نارەحەتی بوو بۆ دانیشتوانی سۆڤیەتی سەر کەناری رووباری ئاراس بۆیە ئەگەر ئێوە نیازی جم و جوڵتان نیە. هیچ نەبێ رێگای ئێمە بدەن ئەوان تێك‌بشکێنین لەوە دەچێ ئەو رووداوە هاندەری سەرەکی بێت بۆ جولانی هێزەکانی سۆڤیـەت و. یارمـەتی دانی هێـزەکـانی تورك و داگیر کردنی باکوری رۆژهەلاتی ئاگری بچـووك. لەو کاتەدا نوێنەری باشناق (فاهان) چەند رۆژێك پێش کارەساتەکە ناوچەی ئاگری جێ هێشتبوو. لە تاریکی شەو لە سنوری روسیا پەری بووەوە. روسەکان بەری‌بان کرد بوو. کاتی رایان گرتبوو و لێیان پرسی بووەوە. بە زمانی روسی وەلامی‌دا بوونەوە. دوو دڵی نەکرد بوو لە پەرینەوەی سنور لەو شەوە ئەنگوستە چاوەدا لە سەرەتادا باسم کرد پانتایی راپەری‌یەوە تا سنوری عیراق ـ سوریا درێژ دەبووەوە. ئەو راپەرینە هەر تەنیا لە

ناوچــەی ئاگـری و دەورو بەرەکــەی نەبوو. کاتی هێزەکانی ئاگری دەسەلاتیان بەسەر ناوچــەکــەدا کێشـا. ئیـدارەی کوردی سەربــەخۆیان لێ دامەزراند. ئالای سەربەخۆیی

کوردستانیان لێ هەڵ گرد. بەڵام لە ناوچەکانی تری کوردستان شۆڕشگێڕە کوردەکان شەڕی پارتیزانیان دژی دوژمن دەکرد.

لە پێناوی ئاگادار بوونی خوێنەری بەڕێزی کورد لەسەر پوختەی مێژووی ئاگری. پێویستە بڵێم کە خەباتی گەلی کورد لە پێناوی وەرگرتنی مافە نەتەوەییەکانی لە ئاگری و ناوچەکانی تری کوردستانی تورکیا هەر بەردەوام بوو. شۆڕشگێڕە کوردەکان هەر بەردەوام بوون لەبەر پەرچ دانەوەی هێزەکانی تورك وگورزی باشیان لێ دەوەشاندن و راویان دەنان. زۆربەیان لە دوای رووخانی راپەرینی ئاگریش بەردەوام بوون لەسەر خەباتی نەتەوەیی خۆیان. هەر وەکو لە چیای ساسون و دیرسیم رووی دا. دکتور کامەران بەدرخان لەوو تاریکیا بە ناونیشانی (کوردستان) کە لە رۆژنامەی (رۆژهەڵات) بڵاوکرایەوە. کە لە بەیروت بە زمانی فەرەنسی دەر دەچوو نووسی بووی : ئەو خەباتە تا ساڵی ١٩٣٨ بەردەوام بوو.

سەر نەکەوتن و رووخانی راپەرینی ئاگری بەری زمان و قەلەمی نووسەرە تورکەکانی بەر هەڵدا. با بۆ نموونە بروانینە قسەی محمود ئەسات. وەزیری دادی کۆماری تورکیا. کە لە شاری ئودەمش رایگەیاندو. لە رۆژنامەی (ملیت) لە ژمارەی ١٩ / ئەیلول / ١٩٣٠ بڵاو کرایەوە

دەقی قسەکەی

ئەبی دوست و دوژمنان باش بزانن کە تورك خاوەنی ئەم نیشتمانەیە. ئەوانەش کە خوینی پاکی تورك لە دەمارەکانیان دا نیە. لە خزمەتکاری و نوکەری بەو لاوە هیچ مافێکی تریان لە نیشتمانی تورك دا نیە.

گەلی کوردی تێکۆشەر شارەزای تەواوی سیاسەتی حکومەتی تورکیا بوو. هەر بەشێوەیەکی سروشتی بە ژیانی دیلی و نوکەری رازی نەبو بۆیە لە پێناوی ئازادی و کەرامەتی خۆی هەزاران قوربانی دا ئەمروش رزگاری خوازە کوردەکان ئەو ئەمانەتەی بە خوێنی شەهیدانسەقامگیر بووە لە گەردنیانەو. تا ئێستاش هەر بەردەوامن لەسەر ئەو رێگایە. محمود ئەسات بە لەخۆبایی بوون و هەست کردن بە سەرکەوتن. وەکو وەزیرێکی حکومەتی تورك تەعبیری لەو دیدە رەگەز پەرستییە کردوو. لە رۆژنامەی (ملیت) بڵاوی کردەوە. ئەو سەرکەوتنەی ئەو باسی دەکات نەدەهات ئەگەر ئەو ماشینە سەربازییە گەورەیان بۆ ساز نەکردایە. ئەگەر ئە (٦٦) هەزار سەربازو ژاندرمەیان بە پاڵپشتی سەد فرۆکە و ژمارەیەکی زۆر لە توپ و رەشاشی گەورە. ئەگەر دەوڵەتی شاهنشای ئێران لەو بوارە یارمەتی نەدا نایە ئەوانەیان دەتوانی ئەو سەرکەوتنە بە دەست بینن. سەرباری ئەو هەموو تواناو رێگا بۆ خۆش کردن و پشتیوانیە دەوڵەتی تورك تا چەندین ساڵیش تا جۆگەی خوێنی هەڵنەبەستنەی توانی دەسەلاتی تەواوی خۆی بەسەر ئاگری دابسەپێنێ.

دوای ریك خستنی کارمکانیشیان. له روژنامەکانیان به گالته باسی داوا کاری و مافەکانی نەتـەوەی کوردیـان دەکرد. وێنەیەکی کاریکاتێری یان بەشێوەی گۆرێك لەسەر لوتکەی ئاگری کەورە. سەرەکەی تری درێژ دەبۆوەوە بۆ ئاگری بچوك. لەسەر کێلی قەبرەکەش ئەو زاراوە گالتە جاری پەش نووسراو بوو: (کوردستانی خەیاڵی تا هەتایە لێرە لە گور نرا) لەراستی دا هەرگیز بەبیری ئەو رەگەز پەرستانەدا نەدەهات کە فکری رزگاری نیشتمانی گەلی کورد وەکو تافگەیەکەو وەستانی بۆ نیە هەر چەندە بن بەست و ئاستەنگی مەحکەم و بەهێز بخەنەبەر ئەو تافگەیەو هەولی گرتنی ئاومکە بدەن.

ئەوا فشاری ئاومکە هەموو بەست و ئاستەنگێک لەبەردەمی خۆی رادەمالیت تەنانەت هێـزی ئەو رامـاڵینـە گێروگـرفتی سەخت و گەورەش دروست دەکـات. ئەوە هەرگیـز چارەســەرێکی عاقـلانـە نیـە بۆ ئەو مەسەلەیە. بەڵکو چارەسەر ئەوەیە بەست و جۆگا لەبــەردەم ئەو تافگەیە دروست بکرێت. سود لە ئاومکە وەربگیرێت بۆ ئاوەدان کردنەوە خۆش گوزەرانی.

نووســەر لێرە لەســەر نووسینی کێـلی گورەکـە بیروڕای خۆی نالی: دا هاتــوو ئەوە دەسەلمێنێ. ئایا کوردستانی خەیاڵی. یان دەسەلاتداریتی تورك لەسەر کوردستان لەنێو ئەو گۆڕەدا دەنێژرێ. و هەمیشە وا دەخوازێ.

ئەوەی وە دیارکەوتووە کە دوای ئەو کاریکاتورەی رۆژنامەی میللەت کردویەتی. مرۆڤی لەسنگی ئاگری دا لە نێو چیاکانی کوردستانا. نێژرراوە. چەند جار تورکیای هەژاندووە.

نیشانی داوە کە هەرگیز نەمردووەو نامرێ. ئێستاش. دوای ئەوەی خوێنەری بەرێز هەندێ شارەزای خەبات و قوربانی کورد بوون لە پێناوی سەربەخۆیی نەتەوەییان دا. ئیجازەیان لێ وەردەگرم رێگام بدەن. بە هەموو رێزو حورمەت و دڵسۆزی یەك لە بەردەوام یادی شەهیدانی ئازادی کورد بنوشتێمەوەو کرنوش ببەم ئەو شەهیدانەی سەر بەرزو لە خۆ بوردوانە خوێنی سووری خۆیان لەسەر خاکی پاکی کوردستان رشت. بۆ ئەوەی کوڵی ئازادی و کەرامەتی یان بکەشێتەوە ئەوانە لەویژدانی میللەتا زیندوون، ئەوانە لە ژیان ماون لەو تێکۆشەرانە سلاویان لێ ئەکەم و بە کەرمی دەستیان دەکوشم.

# دوا وشە

شیاوی باسە هەوالنێری رۆژنامەی (تایمز) کە زانیاری و هەواڵی دەربارەی راپەرینی چیای ئاگری بۆ رۆژنامەکەی دەنووسی هەموو هەواڵەکانی لە هەیئەتی ئەرکانی گشتی جەنگی تورکیا وەردەگرت. هەرگیز من پێشتر. وە لە هیچ بۆنەیەکەدا باسی ژمارەی تەواوی جەنگاوەرەکانی ئاگریم نەکردووە. چونکە حکومەتی تورك و رۆژنامەکانی - ئەوی رۆژی - دەهۆلیـان بـو (کـوایـە) سەرکەوتنەکانی خۆیان بەسەر راپەرینی چیای ئاگری لێ دەدا.

شتەکانیان بە شێوەیەکی سەر سور هێنەر گەورە دەکرد. بە جۆر یك هیچ شتێکیان بۆ ئێمە نەهێشتبووەوە دەربارەی راپەرینەکەمان باسی بکەین بەڵام من لێرە بە چەند ووشەیەکی کورت دەڵێم. ئەو پیاوە قارەمانانە کە ماوەی پێنج ساڵ و نیو نەسەنگەرەکان بەرگری یان کرد. توانیان ئیدارەیەکی کوردی سەربەخۆ پێك بهێنن. ئاڵای سەربەخۆی کوردستانیان بە بەرچاوی حکومەتی تورك و هێزە سەربازی یەکەی لەسەر لوتکەکانی ئاگری شەکاندەوە.

توانیان چوار هێرشیی گەورەی هێزە چەکدارەکانی تورك بۆ سەر مەڵبەندی شۆرش تێك بشکێنن. کاتی من ئێستا ژمارەی ئەو کوردا نەم وەبیردێتەوە. بێ دوو دڵی هەقّ بەگەلی کورد دەدەم شانازی بەرو لەگیا بنازو ئازاکانی خۆی بکات منیش خۆم کە کوردم. بۆ من گەورەترین شانازی‌یە.

هەواڵنێری رۆژنامە بەریتانیەکە موبالەغەی گەورەی لە ژمارەی ئەو جەنگاوەرە دلێرانە کردووە. لەبەر ئەوەی قسەقسەرادەکێشی منیش لێرەدا بەپێویستی دەزانم کەپەنجە بۆ شەری کانی کورك درێژ بکەم کە هەموو هێزەکانی ئاگری بەشداریان تێدا کرد. هێزە زیادەکەش کە بۆ یارمەتیمان هاتبوو خەریکی بەیەکا هەڵچوون بوو لەگەڵ ئەو هێزە سوارەی تورك کەپاراستێ فرۆکە پێکراوەکەی پێ سپێردراوەئەمەئەوهێزە بوو کەبەنیازی لوتکەی ئاگری هاتبوو. بەڵام کاتی گەیشتنی. شتێکی وای بەدی نەکرد کەپێویست بە مانەوەیان بکات. بۆیە بەرێگای خۆی دا گەرایەوە لەکاتی گەرانەوەیدا. رووبەرووی هێزێکی سوارەی دوژمن بوو و شەرلەنیوانیان‌دامەزرا. ئەو کەسەی بە تفەنگیش فرۆکەکەی خس ئیبراهیمی کوری ئەیوب ئاغای برازای برو بوو. لە دوا هێرشی تورك بو سەر ئاگری. کە هەواڵنبری رۆژنامەی تایمز لە زمانی ئەرکانی جەنگی تورك نووسی بووی. ژمارەی هێزەکانی تورکی رەوانەکراوی سەر ناوچەکانی بایەزید و وانی بە (٦٠) هەزار سەرباز و ژاندارمری تەقدیر کرد بوو. سەد فرۆکەش پشتیوانی لێ دەکردن. دەتوانم بڵێم. بە مەبەستی هەندێ نزیك بوونەوە لە واقع دەتوانین ئەو ژمارە دابەش بکەین بە دوو. واتە بڵێین هێزەکانی تورك (٣٣) هەزار سەرباز و پەنجا فرۆکە بوو. هەروەها دەتوانین بە ئاسانی راگەیاندنەکەی هەواڵنێری رۆژنامەی تایمز پوچەڵ بکەینەوە کە دەیووت (هەزاران چەکداری کورد لە چیای ئاگری خۆیان لەسەنگەری مەحکوم ناوە). دەتوانم بێ دوو دلی بلێم ئەگەر هێزەکانی ئاگری بگەیشتایە (٥٠٠) چەکدار لەو شەرەدا ئەوا سەرەنجامی رووداوەکانیان دەگۆرێ. بەڵێ سەرباری ئەو ژمارە کەمەشیان. صالح ئومەر تاغ باشایان ناچار کرد داوای هێزی زیاتر بکات بۆ ناوچەی وان.

من لێرەدا نامەوێ لە توانای سەربازی تورك کەم بکەمەوە. چونکە من خۆم چەندین ساڵ لە سوپای عوسمانی‌و پاشان تورك خزمەتم کردووە. شان بەشانی سەربازی تورك لە شەرەکانی ئادا نا وو تلق و یەمەن و روسیاو جیورجیاو ئەرمینیا بەشداریم کردووە.

شاهیدی دلێری و ئازایەتیان بووم. بەتایبەتی ئازایەتی هەڤاڵە ئەفسەرە تورکەکانم بەڵام هەر وەکو هەق دەڵێ. شەرەکانی ئاگری. بۆ دۆست و دوژمنی دەرخست. هیچ بواری گومانی نەهێشتەوە کە ئەوانە ناتوانن خۆیان لەبەردەم کورد بگرن. کورد لە شەردا بورکانن. قەت بیر لەژمارەی خۆیان ناکەنەوە. ئەگەر نەتەوەییانی کورد بەراستی شەر بکەن و خیانەت لەیەکتر نەکەن.. هاوکاری دوژمنی نەتەوەیی خۆیان نەکەن. هیچ جارێک دوژمنێک ناتوانێ پشتییان لەزەوی بدات و بەسەریان دا زاڵ بێت.

# ئیحسان نوری کێ بوو ؟

- ئیحسان نوري پاشا ساڵی ١٨٩٢ لە شاری بەدلیس . لە گەڕەکی ئاڵی گوڵی لە دایك بووە . بەدلیس شارێکی مێژوویی بە ناوبانگە لە کوردستانی تورکیادا. سەدان ساڵ ناوەندی شەرەفخانیە کوردەکان بوو.

- دەرچووی ئەکادیمیای جەنگیی ئەستەنبول بوو. وەکو ئەفسەرە کوردەکانی تر لە شەری سەربەخۆیی تورکیا بەشداری کرد. لەو شەرانەدا لێهاتویی و ئازایەتی خۆی نواند . نوێنەری کەمالیەکان بوو لە سیواس لە هاوینی ١٩١٩ دا .

- دوای ئەوەی سەرکردەکانی کۆماری تورکیا . لە ساڵی ١٩٢٤ لەو بەڵێنانە پەشیمان بوونەوە کە بە کوردیان دا بوو وسیاسەتی دژایەتی کوردیان گرتە بەر . ئیحسان نوری تێ گەیشت کە لە شەر بەولاوە ڕێگایەکی تر نیە بۆ هێنانە دی مافەکانی گەلی کورد . هەر بەو مەبەستەش رووی کردە شاخ . بۆ ئەوەی بتوانی لەوێ هێزێکی کوردی پێك بهێنێت . ئەو کۆششەساڵی ١٩٣٠ بەردەوام بوو . لەوێ سەرکردایەتی راپەرینی ئاگری کرد .لەلایەن حیزبی خۆیبوون پلەی ژەنەراڵی پێ درا .

- دوای سەرکوت کردنی راپەرینی ئاگری ساڵی ١٩٣٠ لە لایەن هێزەکانی تورك . بە پشتیوانی ئێران و شورەوی . رووی کردە ئێران و بوو بە پەناهەندە.

لە ئێوارە رۆژێکی ساڵی ١٩٧٥ ماتورسکلیك لێی داو شەهیدی کرد دەنگ وا بوو ئەو ماتورسکلە بە نەخشەی دەزگای جاسوسی بەدناوی ساواك ئەو کارەی ئەنجام داوە . چونکە پێش بینی ئەوەیان دەکرد ئیحسان نوری هەوڵی بینینی سەرۆك بارزانی دەدات . کە دووچاری کارەساتی ١٩٧٥ بوو بوو .

ـ دەگێڕنەوە جارێك رضا شا بەرێكەوت سەردانی ئەو زیندانە دەكات كە ئیحسان نوری لێ زیندانی بوو هەموو زیندانیەكان بە چەپلە ریزان بە پیریەوە دەچن . ئیحسان نوریش بە تەنیا لە سەر جێگاكەی خۆیدا دەنیشێ و هاوبەشی خەڵكەكە ناكات لەو پێشوازیە .

كاتێ رەزاشا سەر بەهولەكەدا دەگرێت . چاوی پێ دەكەوێت . زۆری بەلاوە سەیر دەبێت . لێی دەچێتە پێش . كاتێ ئیحسان نو ریش دەزانێ رەزاشا بەرەو رووی ئەو دەچێت هەلدەسێتەوە پێشوازی دەكات رەزاشا لێی دەپرسی بۆچی بە تەنیا دانیشتویت و لەگەڵ زیندانیەكان نەهاتیتە دەرەوە ؟ ئەویش لەوەلام دا دەڵێت : منیش وەك تۆ ئەفسەرم وەگوایە مافی پەنا هەندەیتان داوەتی .كەچی ماوەی سی‌ساله خۆم و خێزانم لەزیندان داین .كاتێ رەزاشا ئەزانێ ئەمە ئیحسان نوری پاشایە . بەیاوەرەكانی خۆی دەڵێت : كەل و پەلەكەی ببەنە دەرەوە. ژنەكەی ئازاد بكەن . یارمەتی پیویستی ژیانیان بۆ دابین بكەن و خانویكیان بدەنێ .

ـ ئیحسان نوری ماوەی ٤٦سال لەپەناهەندەیی‌لەئێران ژیا. ئەو سالانەی بە وەزعێكی دەروونی سەخت و دژوار بەری كرد لە لەو سالانەدا دوو كتێبی بە ناو (راپەرینی ئاگری) و(ژیانم) بەزمانی كوردی نووسی . هەروەها دەربارەی (مێژوی نەژادی كورد) كتێبیكی بە زمانی فارسی نووسی‌و لە سالی ١٩٥٥ لە چاپخانەی (سپیر) بلاوی كردەوە .ئەم نامیلكەی‌ئێستاش كە لە بەردەستتان دایە .یەكەم جار بە زمانی كوردی تێكەلاو لە شێوەكانی كرمانجی سەروو . خواروو زازایی نوسراوە. ئەم نامیلكەیە بەزنجیرە لەگۆڤاری (هیڤی) بلاو كراوەتەوە .هەروەها لەلایەن ئاموژگای كوردی پاریس وەرگێردراوەتە سەر زمانی فەرەنسی و لەسالی ١٩٨٦ لەجنیف بلاوكراوەتەوە .كاك صلاح بەرواریش وەریگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی . منیش لەعەرەبی‌یەوەو وەرم گێرایە سەر شێوەی كرمانجی خواروو .كاك رێكەوتیش ئەم‌وەرگێرانەی لەگەل دەقە ئەصلی یەكەی‌كەلە گۆڤاری هیڤی دا بلاو كرایەوە .

بەراوردی كردو پێیدا چووەوە . گەلێ ووشەو ناوو رستەو پەرەگرافی بۆ راست كردەوە كە لەگەل دەقە عەرەبی‌یەكەی جیاوازییان هەبوو . بۆیە لە ناخی دلەوە سوپاسی‌دەكەم .

هیوادارم ئێمەش بەم كارە خزمەتی كەكمان كردبێ

# لاوكى ئاگرى

ئاگرى شەر كر ،
ئارارات تژە ببو
ديسان ببو گول پەنگ
ئاگرى خوێن دگرى ...
ئاگرى خوێن دگرى
سەرى خوە راكرن
شەرێ خوە كرن
لێ تێنەگشهتن
باب و برا هات كوشتن
دايك هێڤيدار
خوشك دلوڤان
زاروكێن هوير سيوى مان
لپشتا شەر
كالەكى پشتا خوە دابو كەندالەكى
بەرێ خوە دابوو چيايێ ئاگرى
دنهێرى و وانى دگوت : ـ
لێ فەلەكێ تە چما لمە واكر
تە مالا مە خەراكر
تە زاروك و زيچى مەبێ خومدى كر
هێ فەلەكێ خاينێ تە چما لمە واكر
تە كونێ مە لناڤا كونا راكر
تە مالا مە خەراكر
تە زاروك و زيچى مە بێ خومدى كر
لچول و ئورتا پەريشان كر
تە دلێ دوستان شكاند
دلێ دوژمنا بمە شاكر
فەلەكێيەمان ، خاينىيەمان
بێ بەختێيەمان ، يەمان ... يەمان
لێ وايێ .. لێ وايێ ... هێ فەلەكى

هێ برانۆ لێ بنێرن
چیایێ ئاگری دیسا بداخ و
دۆمانە چی بلندە
دەقاما خوە بلند کریە
رەشبا خوە گرێدایە
حزنی بوویە بان ڤێکە چیایێ هندر
دە تووێ بێژی ئاگری دیسا بگرو
هێرسا خوە تژە بوویە.
ئاگری دیسا ژ بورکانان تژە بوویە.
ئاگری . ئاگری.. ئاگری خوێن دگری
فەلەکێ یەمان ، خاینێ یەمان
بێ بە ختێ یەمان ،یەمان ، یەمان ..یەمان
لێ وایێ لێ وایێ .. هێ فەلەکێ.

★★★

هی مەرامو لەشکرێ رۆمێ زالێ چون ترکی هاتن
داکەتن بازارو گوندا
زالمان لژور کرن گرمکرا بالفروکێ و تەیاران
لژێر کرن تڤە تڤاتۆپانێ و میترالۆزان
خرا بکرن بازارو گوند ژ بندە
هێ فەلەکا خاین مێرێن مە کوشتن
مالێن مە تالان کرن ، زارۆکێن مە سێوی هشتن
فەلەکا خاینە نەرندە
ئیرۆ لشوینا وارێ شێران دواقی رۆڤی
دخوینە پەپوك وکوندە
فەلەکێ یەمان ، خاینێ یەمان
بێ بەختێ یەمان ، یەمان یەمان
لێ وایێ لێ وایێ .. هێ فەلەکێ ..
هی دە مەرا مونیفە ڤە فەلەکا خاینە نەرندە
ئەمێ گازیا خوە ببن ئێل و مالباتێن کوردا
بلا دگازیا مە وەرن
ئیرۆ رۆژا تەنگێی یە ، بێ کارو بێ کێرنایە

هەچیێ بناموس و شەرەفە
بلادگازیا مەومرن

هەچیێ بێ غیرەت و بێ کێر بن
بلا دهمبیزێ ژنێ خوە دا بمینن
فەلەکا خاینە نەرندە
ئەمێ هیڤی و بەندا خوە زاروکێن باڤا
سیوێین خوە گرێدین
ڤە هندەك ببینە دبە هندەك نەبینە
هێڤیا من دو ێ هیڤیــێ هەیە
کو مێرو شێرین مە رابن
مێر خاسێن مە روژێ سوبێ رابن
فەلەکێ ژڤێ دەرێ بقەوتینە
حەیفا مە هەلینە بمێرو مێر خاسبن
هاوارو کوردو گەرمکە حەیفا کوردو کوردستانێ
لعەدرێ نەمینە
فەلەکێ یەمان ، خاینێ یەمان ..
بێ بەختێ یەمان ، یەمان ، یەمان ...
لێ وایێ لێ وایێ .. هێ هێ فەلەکێ ..

★ ئەم لاوکـە بەسـۆزە تا ومکو ئێستاش ویردی سەر زمانی رۆلە بەشەرمفەکانی کوردستانەو . لە بۆنەو ئاهەنگەکانا بە دمنگی بەسۆز دمیلێنەوە ... هەرودها لەو سالانەی دواییدا هونەرمەندی کورد ، شڤان پەروەر ، لەسەر کاسێت تۆماری کردووە .




چاپی دووه‌م/ ١٩٩٥
نرخی (١٠) دیناره